المعهد العالمي للفكر الإسلامي (١٢)

# المسلمون و البديل الحضاري

حيدر عبد الكريم الغدير

ترجمة:
ياسين أحمد الزنكني

دابەشكاری سەرەكیی بڵاوكراوەكانی پەیمانگا:
٠٧٧٠٢٤٥٥٥٠٤

پەیمانگای جیهانیی فیكری ئیسلامیی (١٢)

# مسوڵمانان و جێگرەوەی شارستانیی

نووسینی:
حەیدەر عەبدولكەریم ئەلغەدیر

وەرگێڕانی:
یاسین ئەحمەد زەنگەنە

ناوی کتێب: مسوڵمانان و جێگرەوەی شارستانیی.
نووسینی: حەیدەر عەبدولکەریم ئەلغەدیر.
وەرگێڕانی: یاسین ئەحمەد زەنگەنە.
لە بڵاوکراوەکانی: پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، ژمارە (١٢).
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (٢٧٠٢)ی ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.
چاپی: یەکەم – سلێمانی – ٢٠١٠.
چاپخانە: شڤان.
تیراژ: (٧٠٠) دانە.
ئیمەیلی پەیمانگا: iiitkurdistan@yahoo.com

# بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## پێشەکیی وەرگێڕ

نامیلکەی (المسلمون والبديل الحضاري)ی نووسەر (حيدر عبدالكريم الغدير) کە لە کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوودا نووسراوە، واتە پێش رووخانی یەکێتیی سۆڤیەتی جاران و بلۆکی رۆژهەڵات، کە ئەوکات باڵێکی سەرەکیی شارستانییەتی رۆژئاوا بوو.

زانیارییەکانی نێو ئەم نامیلکەیە تا ئێستا سەنگ و بایەخی خۆیان لەدەست نەداوە، هەر چەندە ئێستا زانیاریی و ئاماری زۆرو زەبەند لەبەردەستدایە بۆ دەوڵەمەندکردن و پشتگیریکردنی راستییەکانی کتێبەکە.

شارستانیەتی رۆژئاوا کە ئەمڕۆ لە لایەن ئەمریکا و رۆژئاواوە رابەرایەتی دەکرێت، هەر چەندە لە رووی تەکنەلۆژیای ماددیی و گەیاندن و پەیوەندییەکان و...هتد. لە چڵەپۆپەی شکۆیی و سەرکەوتندایە، بەڵام هەموو ئەمانە دڵنیایی و بەختەوەریی و حەسانەوەی گیانییان نەبەخشیوەتە مرۆڤەکان و کێشە سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان و برسیەتی و هەژاری و نادادپەروەریی لە جیهاندا چارەسەر نەکردووە، بەڵکو لە جاران زیاترە، جیهان بۆتە گوندێکی زۆر بچووك لە سایەی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوودا، بەڵام خەڵکانی ناو ئەم گوندە بەختەوەر و دڵنیانین و پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و گیانییەکانیان لەوپەڕی لاوازیدایە.

هەندێك لە زانیارییەکانی نێو نامیلکەکە لە ساتەوەختێکدا نووسراون، بارودۆخی سیاسیی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیی رۆژئاوا، کە خۆی لە دوو باڵی سەرەکیدا دەبینییەوە، لە هەلومەرجێکی تردا بوون، جیهانی ئیسلامیش بەهەمان تەرز. لە سەرەتای نەوەتەکاندا بلۆکی رۆژهەڵات و یەکێتیی سۆڤێتی جاران هەڵوەشایەوە و کۆمۆنیستی چووە نێو پایزی تەمەنیەوە، شارستانییەتی رۆژئاواش

ئێستا خۆی لە تاکە باڵی سەرمایەدارییدا دەبینێتەوە، بە رابەرایەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەمڕۆ وڵاتی (چین) خاوەنی ئابوورییەکی بەهێزەو لە ئاستی جیهاندا لە پلەی دووەمدایە، شمەك و بەرهەمەکانی بازاڕەکانی جیهانی تا رادەیەکی زۆر قۆرخ کردووە، بەڵام خاوەنی جیهانبینی و دیدوبۆچوونێکی تایبەت نییە، تا وەك جێگرەوەی شارستانیی تەماشا بکرێت.

جەنگی کەنداوی یەکەم و دووەم و داگیرکردنی عێراق و ئەفغانستان، جارێکی تر هاوکێشەی سیاسیی و ئابووری و سەربازییان لە ناوچەکەدا گۆڕی و دەرەنجامی نەرێنیی لەسەر توانا و وزەی مسوڵمانان بەجێهێشت.

نموونەی جوانی تازە پێگەیشتوو لە جیهانی ئیسلامییدا هەیە، وەك ئەزموونی مالیزیا و تورکیا، کە توانیویانە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ وێنەیەکی ئیسلامیانەی رابەرایەتیکردن و پێشکەوتن و گەشەی سیاسی و ئابووریی بخەنە روو، دەکرێت وڵاتانی تری ئیسلامییش بەپێی هەلومەرجی خۆیان سوود لەم ئەزموونە وەربگرن.

ئیسلام وەك بەرنامە و پەیامێك دەوڵەمەندە و تواناکانی بێسنوورە، بەڵام مسوڵمانان هێشتا زۆریان ماوەو هەنگاوی زۆریان لەپێشدایە تا بتوانن بەکردار ببنە جێگرەوەی شارستانیی.

لە کۆتاییدا هیوادارین توانیبێتمان بە وەرگێڕانی ئەم بابەتە بەپێزە بۆ سەر زمانی شیرینی کوردیی، خزمەتێکمان بە خوێنەری کورد کردبێت لە بواری فیکری ئیسلامییدا.

سبحانك اللّهم وبحمدك أشهد أن لا اله إلاّ أنت.

**یاسین ئەحمەد زەنگەنە**

**٢٠١٠/١١/١٢**

**هەولێر**

# پێشەکیی چاپی یەکەم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سـيئات أعمالنا، ونصلّ ونسلّم على الرسول الحبيب وعلى آله وأصحابه مـن الله أفـضل الـصلاة وأتم التسليم، وبعد:

ئەم نامیلکەیە کارتێکی گرنگە، بە شێوەیەکی ورد ئەو هاوارە وریاکەرەوەیە تۆمار دەکات، کـە لـە نـەوەکانی شارسـتانی ڕۆژئـاواوە (بـە هـەردوو بـاڵی سـەرمایەداریی و سۆشیالیستی)یەوە بەرز بۆتەوە.

ئەمە توێژینەوەیەکە سەرەڕای قشتیی قەبارەکەی، هەوڵ دەدات بگاتە ئـەنجامێك، ناوەرۆکەکـەی ئەوەیـە (کرمۆڵبـوون و داخـوران لـە شارسـتانییەتی ڕۆژئـاوا بۆتـە نەخۆشـــییەکی کوشـــندەی درێژخایـــەن و ڕۆژانـــە لـــە پەیکـــەرە زەبەلاحەکـــەی دەپووکێنێتەوەو، نزیکی دەکاتـەوە لـە چارەنووسـە مسۆگەرەکەی، کـە بریتییـە لـە رووخانی تەواو، تا بوار بڕەخسێنێت بەرامبەر خولێکی نوێی شارسـتانییەتێکی تـازە، بەڵکو مرۆڤایەتی رزگار بکات و بیخاتە سەر پەیڕەو و بەرنامەیەکی پتەوی ژیان).

سـەرەڕای ئـەوەی ئـەم دەرەنجامـە یەکلاکەرەوەیـە، توێژینەوەکـە ڕوودەکاتـە مـسوڵمانان و پێیـان رادەگەیـەنێت، پێویـستە لەسـەریان بـزانن خـوای گـەورە سەرکەوتنی ناداتـە کەسـانێك کـە شایـستەی نـەبن، مـسوڵمان بـن یـان نامـسوڵمان.. پێویـستە مـسوڵمانان هـەوڵ بـدەن تـا شایـستە بـن بـە جێنـشینی و توانـاداری و دەسەڵات، ئەم رێگایەش دووردرێژ و سەختە، پێویـستە لەسـەریان بیگرنـە بـەر. بـا مـسوڵمانان خـەیاڵپڵاو نـەبن و پێیـان وابێـت کـە رووخـانی شارسـتانییەتی ڕۆژئـاوا وادەکـات سـەرکردایەتی شارسـتانیی بەدەسـت بێـنن و، وەك دەسـتکەوتێکی سـارد دەکەوێتــە بەردەســتیان، ئــەم جــۆرە بیرکردنەوەیــە خــەوی تەمــەڵ و بێکــار و خەیاڵپڵاوەکانە.

چیرۆکی ئـەم توێژینەوەیـە دەگەڕێتـەوە بـۆ بـەهاری سـاڵی (١٤٠٧ك ـ ١٩٨٧ز)، کاتێك پەیوەندیی لاوانی مسوڵمانی عـەرەب، داوەتنامەیـەکی ئاڕاسـتەی دکتـۆر تـەها جابر عـەلوانی سـەرۆکی پـەیمانگای جیهـانیی فیکـری ئیـسلامیی کـرد، بـۆ وتنـەوەی بابەتێك لەسەر (مسوڵمانان و جێگرەوەی شارسـتانیی)، ئـەوەبوو لـە چـادرگەیەك لـە شاری (البنی) لە ویلایەتی نیویۆرك، لە ١٩٨٧/٣/٥ پێشکەش کرا. باسەکە سەدایەکی باشـی دایـەوەو زۆرێـك لەوانـەی ئامـادەی بـوون یـان بیـستیانەوە، حـەزیان دەکـرد بنووسرێتەوە و چاپ بکرێت، لەگەڵ بەڵگەدارکردنی بـە هـەموو ئـەو دەقانـەی کـە لـە موحازەرەکەدا هاتوون.

لەسەر خواستی برایانمان لە لاوانی پەیوەندیی و هـەروەها بـۆ گشتاندنی سـوودی ئەم توێژینەوەیە، لە روانگەی تێڕوانینی (پەیوەندیی لاوان) لە خزمەت کێشەی لاوانی مسوڵمانی هاوچەرخ، (پەیوەندیی لاوانی مسوڵمانی عـەرەب) و (پـەیمانگای جیهـانیی فیکری ئیسلامیی) رێکەوتن لەسەر هاوکـارییکردن بـۆ لەچـاپدانی ئـەم توێژینەوەیـەو بڵاوکردنەوەی مادده فیکریەکەی، ئەمەو یەکەی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لـە پـەیمانگا بەشداریی کرد لە کۆکردنەوەو ئامادەکردنی نامیلکەکەدا.

پەیوەندیی لاوان خۆشحاڵە کە ئەم توێژینەوەیە یەکەم بڵاوکراوەی هاوبەشـی بێـت لەگەڵ پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی، بە هیوای ئەوەی بڵاوکراوەی هاوبەشـی تری بە شوێندا بێت، لە هەموو ئەو کێشەو بابەتانـەی لای لاوانـی مـسوڵمانی عـەرەب گرنگن.

خوای گەورە لە پشت مەبەستەکانەو ئەویشە رێنوێنیکەر بۆ رێگای راست.

**پەیوەندیی لاوانی مسوڵمانی عەرەبی**

**لیژنەی رۆشنبیریی**

# پێشەكیی چاپی دووەم

خۆشحاڵییە بۆ پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی ئەم توێژینەوە كورتە پێشكەش بكات، لە ژێر ناونیشانی (مسوڵمانان و جێگرەوەی شارستانیی)، توێژینەوەیەك ناوەكەی ئاماژەیە لەسەر ناوەڕۆكەكەی.

باسەكە بریتییە لە تێبینیكردن و ڕێكخستنی هەندێك لە گرنگترین هاواری وریاكەرەوەی شارستانی، بە ئاوابوونی خۆری شارستانیی ڕۆژئاوا لە لایەن مامۆستایانیانەوە، ناكرێت ئەو مامۆستایانە تاوانبار بكرێن بەوەی هیچ دەربارەی ئەم شارستانییەتە نازانن، یان سەرچاوەی هێز و سەرچاوەی لاوازیی شارستانییەتەكە جیاناكەنەوە. ئەو بیرمەندانەی ئاگادارییەكانیان هێنراوەتەوە، ڕوونیان كردۆتەوە، كە شارستانییەتی ڕۆژئاوا، شارستانییەتێكە بە كۆمەڵێك كێشەی ریشەییەوە دەناڵێنێ، كە پێشتر شتی وای بەخۆوە نەبینیوە، وای كردووە هێڵكاریی شارستانییەتەكە هێڵێك بێت بەرەو لێژبوونەوە مل بنێت. سەرەڕای هەموو ئەرێنییەكانی كە تێیدایە، كە هیچ دادگەرێك نكوڵییان لێناكات و دانیان پێدا دەنێت.

ئەمە واتە ئەمڕۆ جیهان پێویستی بە سەركردایەتی و جێگرەوەیە هەیە، كاتێك مرۆڤ سەرنج لەو هێزانە دەدات، كە وەك جێگرەوەی نویێ دەخرێنە ڕوو، دەبینێت ئەو جێگرەوانە شایستە نین، ئەمەش لەبەر چەند هۆكارێكی ژیرانە كە لە توێژینەوەكەدا خراونەتەڕوو، لە كاتی تێبینی و لێدوان لەسەر ئاگادارییەكان و دووبارە خوێندنەوەیان.

لەكاتێكدا مرۆڤ دەڕوانێتە حاڵی مسوڵمانان، دەبینێت لەگەڵ داننان بە هەموو نەرێنی و خاڵی لاواز و دژیەكیەكان، ئەوەندە توانایان هەیە (بە هەموو شێوەكانیەوە)، تا وایان لێ بكات ببنە جێگرەوەیەكی شایستە بۆ سەركردایەتی شارستانییەتە چاوەڕوانكراوەكەو ڕاستكردنەوەی كاروانەكەی، گەر مەرجە خودی و بابەتییە داواكراوەكانیان بەدی هێنا.

گەر هێڵكاری شارستانییەتی ڕۆژئاوا لە ئەنجامی كۆتاییدا بوبێتە هێڵێك و بەرەو لێژبوونەوە بڕوات، ئەوا هێڵكاریی نەتەوەی ئیسلام لە ئەنجامی كۆتاییدا دەكرێت بەرەو

بەرزبوونەوە بڕوات[1]. ئەمەش خاڵێکە دەچێتە پاڵ خاڵە هاوشێوەکانی بۆ دروستکردنی قەناعەتێك، کە مسوڵمانان دەکرێت ببنە جێگرەوە شارستانییە چاوەڕوانکراوەکە، گەر مەرجەکانیان لەخۆیاندا بەدیهێنا.

لە کۆتایی وتەدا ئەوە دەخەینەوە یاد، کە پێداگیرییە لەسەر دووخاڵی زۆر گرنگ:

**یەکەم:** رووخانی شارستانییەتی رۆژئاوا کارێکە لە نێوان شەو و ڕۆژێکدا نایەتە دی، شارستانییەتەکان بە کتوپڕ دروست نابن و بە کتوپڕیش ناڕووخێن.

**دووەم:** مسوڵمانان نابنە سەرکردایەتی نوێی شارستانییەت، گەر وەك ئێستا بمێننەوە، پێویستە مەرجە بابەتییەکان بەدەست بێنن، تا شایستە بن بە سەرکردایەتیکردن، چونکە خوای گەورە سوننەت و یاسا و رێسای خۆی هەیە و خۆش دوانی کەس ناکات و کەسیشی بەتایبەت خۆش ناوێت، ئەم رێسایانەش بەسەر مسوڵمان و نامسوڵماندا دەچەسپێن.

پەیمانگای جیهانیی بۆ فیکری ئیسلامیی خۆشحاڵە ئەم توێژینەوەیە بە هاوکاریی پەیوەندیی لاوانی مسوڵمانی عەرەب دەربکات، بە هیوای ئەوەی دەروازەیەکی هاوکاریی بەردەوام بێت و پەیوەندییەکی زانستیی پەرەسەندوو بێت.

**پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی**

**هێرندن– ڤێرجینیا**

**رەجەبی ١٤١٢ك/ کانوونی دووەمی ١٩٩٢ز**

---

[1] ئەم لێدوانانە، پێش رووخانی مارکسیزم و ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە وڵاتە کۆمۆنیسییەکاندا هاتنە ئاراوە، هەروەها پێش راوەستانی شەڕی بەعسیەکان و ئێران و، پێش دەستپێکردنی بەناو قەیرانی کوێت دراون. کە بووە هۆی گەڕانەوەی جیهانی ئیسلامیی بۆ هاوشێوەی سەردەمی کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم، یان هاوشێوەی ئەو سەردەمەی رێکەوتنی سایکس بیکۆی تێدا واژۆ کرا، لە ئەنجامی پەرتکردنی خیلافەت و دابەشکردنی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان لە نێوان وڵاتە رۆژئاواییە سەرکەوتووەکاندا. بەڵام ئێستا ئەو گوفتارانە تێڕوانین و قسەی لەسەرە.

# ئاوابوونی شارستانییەت

ئەو راستیەی کە هیچ خاوەن ویژدان و دادگەرێك نكۆڵی لێناكات، ئەوەیە كە ئەمڕۆ سەركردایەتی جیهان بە دەستی شارستانییەتی رۆژئاواوەیە، بە هەردوو باڵەكەیەوە، سەرمایەداریی و كۆمۆنیستی، جا هەردوو باڵی شارستانییەتەكە لە ململانێیەكی ئاشكرادان بۆ سەلماندنی شایستەییان لە سەركردایەتیكردنی مرۆڤایەتیدا، ئەمەش لە میانەی فراوانكردنی ئەو بازنەیەی كە بڕوای بەو رێباز و بەهایانە هەیە، هەردوو سەربازگەكە هەوڵ دەدەن لە دەروونی خەڵكیدا بیچەسپێنن، هەروەها پتەوكردنی پەیوەندیی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی كە لە خولگەكەیاندا دەخولێنەوەو، هەریەكەیان لە سایەی یەكێك لە سەربازگەكاندان.

شارستانییەتی رۆژئاوا بە هەردوو باڵەكەیەوە لە منداڵدانێكەوە لەدایكبووەو گەشەی كردووە، هەردووكیان دوو ڕووی دراوێكن، چونكە زۆرێك دید و بۆچوون و بەها و دەستپێكیان چوونیەكە.

هەڵوێستی ئیسلامیش بەرامبەر هەردوو شارستانییەتەكە وەك یەك وایە و، هەردووكیان لە یەك سەرچاوەن و هیچ بنەمایەكی جێگیریان نییە، چونكە مرۆڤ بە توانا سنووردارەكەی، دوور لە بەرنامەی خوای گەورە، تەلاری ئەم شارستانییەتەی دروست كردووە، هەروەها ئەو كارەساتانەی تووشی مرۆڤایەتی بوون، بەهۆی لادانیان بوو لەرێگای راست، ئەم لادانەش تەنها باڵێكی شارستانییەتەكە ناگرێتەوە، تا ببێتە بەڵگە لەسەر دروستیی رێبازی ئەوی تریان.

ئەم شارستانییەتە كە بۆ ماوەی چەند دەیەیەك خاوەنی هێزێكی یەكگرتوو بوو، دڵان مەیل و پەرۆشی بوون، خەڵك بە دەستكەوتە مادديیەكانی فریویان دەخوارد. دەركەوتنی كەموكورتی و نەخۆشییە زۆرەكانی دەستی پێكرد، تا ئەو ئەندازەیەی دەستەوەستان بێت لە شاردنەوەی كاریگەرێتی كرمۆڵبوونی، تا گەیشتە ئەوەی سەرنجی دانایان لە نەوەكانی شارستانییەتەكە بۆ خۆی راكێشێت، ئەمانە بە ئاشكرا دەنگیان بەرزكردەوە، كە ئەستێرەی ئەم شارستانییەتە بەرەو نزمی و تیاچوونە، ئەم شارستانییەتە هەندێك بە خەیاڵ بە

نەمریان دادەنا، ئەوا بەرەو شکست دەڕوا، دوای ئەوەی دەرکەوت کە بە کۆمەڵێك کێشەوە گرفتارە، کە داڕێژەرانی شارستانییەتەکە ناتوانن چارەسەری بکەن.

داری شارستانییەتی رۆژئاوا لە گڵ و خاکێکی ماددیدا گەشەی کردووەو یەکەم بەروبوومی ئەرێنی بریتییە لە پێشکەوتنی زانستە سروشتییەکان و داهێنانی تەکنەلۆجی، کە پێشتر مرۆڤایەتی هاوشێوەی ئەوەی بە خۆیەوە نەبینیوە، بەڵام بەروبوومە ژاراوییەکەی بریتییە لەو تیاچوونە کوشندەیەی کە نەوەکانی شارستانییەتی ماددیی هەوڵ دەدەن لێی هەڵبێن، دوای ئەوەی هەموو بەروبوومە ئەرێنییەکان دەستەوەستان بوون لە بەدیهێنانی حەز و خولیاکانیان. ژیریی پەرەی سەند و گەورەبوو لەسەر حیسابی روح و گیان، ئەویش هاتەوەیەك و سیس و لاواز بوو، کاتێك شارستانییەتی ماددیی دەستەوەستان بوو لە بەدەستهێنانی تامەزرۆیی و حەز و خولیا و خواستەکانیان.

راستە مرۆڤایەتی لە جیهانی تەندروستی و چارەسەرکردندا سەرکەوتنی مەزنی بەدەستهێناوە، لە جیهانی پیشەسازی و بەرهەمهێناندا ناوازەبوو، سەرکەوتنێکی بێئەندازەی لە بواری دۆزینەوە گەردوونییەکان و مانگە دەستکردەکاندا بەدەست هێنا، بەڵام کاریگەریی هەموو ئەمانە لەسەر ژیانی دەروونیی مرۆڤ چییە؟ ئایا بەختەوەری و دڵنیایی و ئاشتی بەدەستهێناوە؟

بەڵکو ناڕەحەتی و دوودڵی و ترسی بەدەستهێناوە، لەبەرئەوەی لە روانینیدا بۆ ئامانجەکانی ژیانی مرۆڤایەتی و مەبەست لە بوونی مرۆڤ لە سایەی شارستانیەتی ماددییدا، پێشکەوتنی بەدەست نەهێناوە، بەڵکو بەشی هەر ترسان و تۆقان بووەو، پێوەی دەتلێتەوە، وەك مەترسیی ئەتۆمی، یان نەخۆشیی ئایدز.

ئەو شارستانێتییە لە شوێنێکی خراپدا گەشەی کردووە، بۆیە بەروبوومێکی تاڵی وەك گوژاڵکی بەخشیوە.

ئەوەتا ئەمڕۆ دەنگەکان لێرەو لەوێ بەرز دەبنەوەو وریایی دەدەن بە خراپیی چارەنووسی مرۆڤایەتی، لە سایەی شارستانییەتێکدا، کە خاڵییە لە ئیمان، هەروەك چۆن لە گیانی مرۆڤایەتیش خاڵییە.

# هاواری مەترسی

هاواری زۆر بەرز بۆتەوە لە نەوەکانی ئەم شارستانییەتەوە، ئەوانەی درکیان بە مەترسی خلۆربوونەوەی مرۆڤایەتی کردووە بەرەو نشێو و کەندەلان، بەهۆی دەرهاویشتەکانی ئەو شارستانییەتەوە، پێشبینیی رووخانی دەکەن، چونکە کەوتۆتە لێواری تیاچوونەوە.

ئەوەتا (ئەلیکسیس کاریل) لە کتێبی (مرۆڤ ئەو نادیارەیە)دا ئیدانەی شارستانیەتی ماددیی دەکات و وای دەبینێت، کە ئەم شارستانیەتییە لەدایکبووی خەیاڵئامێزی دۆزینەوە زانستییەکان و حەز و ئارەزوو خەیاڵپڵاویی خەڵکە، ئەو پێشکەوتنە گەورەو فراوانەی لە زانستی بێگیانەکان بەدەستی هێناوە، مرۆڤایەتی هیچی لێ نەچنیوە، جگە لە دڵەڕاوکێ و خەم و پەژارە نەبێت.

ناوبراو دەڵێت: "لەراستیدا ژیارەکەمان وەك ژیارەکانی پێشوو بارودۆخێکی دیاریکراوی بۆ ژیان هێناوەتە ئاراوە، وایکردووە ژیان خۆی لەخۆیدا ئەستەم بێت، بە چەند هۆکارێك کە تا ئێستا تەمومژاوییە. دڵەڕاوکێ و پەژارە، کە دانیشتوانی شارە هاوچەرخەکان پێوەی دەتلێنەوە، دەرەنجامی سیستەمە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانیانە".

پرسیار دەکات سەبارەت بە کەڵك و سوودی شارستانیەتییەك، کە جگە لە چەرمەسەری و بەدبەختی و داڕووخانی رەوشت، هیچی تری فەراهەم نەهێنابێت، دەڵێت: "حەسانەوەو بەرزی و جوانی و هۆکارەکانی ئالۆزبوونی شارستانییەکەمان کەڵکی چییە؟ کاتێك لاوازیمان رێگریمان لێدەکات لە پەنابردن بۆی لەوانەی سوودیان بۆمان هەیە؟

لە راستیدا شایستەی هیچ ماندووبوونێك نییە هەنگاو بنێین بەرەو رازاندنەوەی رێگایەکی ژیان، کە بە داڕووخانی رەوشتیی بۆمان بگەڕێتەوە و ببێتە مایەی شاردنەوەی رێزدارترین رەگەزە چاکەکان".

مستەر (دالاس) وەزیری پێشووتری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لە کتێبەکەیدا (جەنگ یان ئاشتی) ئاماژەی بە کەموکورتی و ناتەواوییەکانی شارستانییەتی رۆژئاوا کردووە و دەڵێت: "لێرەدا شتێك هەیە لە نەتەوەکەماندا بە شێوازێکی هەڵە دەڕوات، گەر وا نەبوایە نەدەکەوتینە نێو ئەم شڵۆقی و ئەم بارە دەروونییەوە". ئەو وادەبینێت کە پێشکەوتنی ماددیی و زێدەڕۆیی لە پیاهەڵدانی بەخششەکانی شارستانێتی رۆژئاوا، بەرامبەرەکەی مایەپووچی گیانییە، کە نەوەکانی ئەم شارستانێتییە پێوەی دەناڵێنن". دەڵێت: "هەروەها دەتوانین بە راشکاوییەوە بدوێین سەبارەت بەو پێشکەوتنە ماددییەی کە بەدیمان هێناوە، لەگەڵ جوانیی بەرهەمی بەکۆمەڵ و ژمارەی ئۆتۆمبێل و ئامێری رادیۆ و تەلەفزیۆن کە تاکەکانی گەلەکەمان هەیانە، بەڵام زێدەڕۆیی لە پیاهەڵدانی ماددیاتدا بیرۆکەیەك دەبەخشێت، کە ئێمە لە بواری رووحی و گیانیدا مایەپووچ بووینە".

وای دەبینێت کە شارستانێتی رۆژئاوا درەوشانەوەکەی لەدەست داوەو هیچی پێ نەماوە کە بە جیهانی بگەیەنێت، بەدوای دەروازەیەك دەگەڕێت تا لە ملی شووشەکەوە بێتە دەرەوە، دەڵێت: "هیچ سوودێك نییە لە دامەزراندنی وێستگەی (دەنگەکانی ئەمریکا)ی تری دەنگ بەرز، مەگەر کاتێك شتێکمان لابێت و بیڵێین، کە سەرنجراکێشتر بێت لەوانەی تا ئێستا وتراون".

گەر (کاریل و دالاس) بێئومێدیی مرۆڤایەتیی لە شارستانێتی رۆژئاوادا رابگەیەنن، ئەوا فەیلەسوفی ئینگلیزی بەناوبانگ (برتراند راسل) رایدەگەیەنێت شارستانێتی رۆژئاوا ناچارە پێگەی سەرکردایەتی مرۆڤایەتی چۆڵ بکات، ئەمەش کۆتایی دەسەڵاتی پیاوی سپییە (نوێنەری شارستانێتی رۆژئاوا) لەسەر چارەنووسی مرۆڤایەتی، دەڵێت: "ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە پیاوی سپی رابەرایەتی بکات، مانەوەی ئەم سەروەرییە بۆ هەتاهەتایی یاسایەك نییە لە یاساکانی سروشت، پێموایە کە پیاوی سپی بە رۆژانێکی تری وا ناگات، وەك ئەو رۆژانەی لە ماوەی چوار سەدەدا پێی گەیشتبوو". پیاوی سپیش تەنها هێمایەکە بۆ شارستانییەتی رۆژئاوا، کە

ئــاوابوونی ئەســتێرەکەی بەدەرکــەوتووە، (راســل) لــەبارەی مەینەتییــەکانی ئـادەمیزادەوە لـە سـایەی شارسـتانێتیی رۆژئـاوادا دەدوێـت و دەڵێـت: "ئـاژەڵانی جیهانەکەمان لەنێو خۆشی و شادیدا نقوم بوون، لەکاتێکدا مرۆڤەکان شایستەترن لـە ئـاژەڵان بـەم فـەڕ و بەختەوەرییـە، بـەڵام لـە جیهـانی نوێـدا بێبەشـن لـە فـەڕ و بەخششەکان، ئەمرۆش بەدەستهێنانی فەڕ و بەختەوەری ئەستەمە".

ئەوەتا (دەنیس دۆرگمۆن) کە لە بەرگریکارە توندەکانی کەسایەتی ئەوروپییە، لـە گەشــبینە توندەکانــە ســەبارەت بــە بــەردەوامبوونی شارســتانێتی رۆژئــاوا بــۆ هەتاهەتایی، نیگەرانە لـەو دەنگانـەی کـە رووخـانی شارسـتانێتییەکەی رادەگەیـەنن، پێیوایە سەدەی بیست، مەشخەڵانی شارستانێتی رۆژئاوای بینیوە، کە دەسەڵاتەکەی هەموو گۆی زەوی گرتۆتـەوەو لەگـەڵ خۆیـدا خراپیـی و بەرهەمـەکانی و بەدەگمـەن بەهاکانی لەخۆگرتووە، بەردەوام شتە بێکەڵکەکانی هەڵگرتووە.

لە هەمان کاتدا ناوبراو بینیی ئەوانەی باسی رووخانی شارستانێتی رۆژئاوا دەکـەن و پێشبینیی دەکەن، ژمارەیان بـەردەوام لـە زیادبووندایـە. ئـەوەی جێگـای سـەرنجە زۆربەی پێشبینیکەرەکان ئەوروپین، ئەوانە لەبری ئەوەی بە سەرسـووڕمانەوە باسـی بڵاوبوونەوەی بلیمەتیی ئەوروپایی لە هەموو جیهاندا بکەن و لە گرنگی بڵاوبوونـەوەی ئـەم بلیمەتییــە خــەڵك ئاگــادار بکەنــەوە، قــسەکردنیان ســەبارەت بــە ئــاوابوونی شارستانێتی ئەوروپا پێ باشتر بووە.

بـەڵام شـاعیری فەرەنـسی (پـول ڤـالێری) کـە کاریگەرییـەکی گـەورەی لەسـەر رەوتـەکانی هـزری ئـەوروپی هەیـە، دوای جـەنگی جیهـانیی یەکـەم سـاڵی ١٩١٩ بـە دەسـتەواژە بەناوبانگەکـەی هـاواری کـرد: "لـە شارسـتانێتییەکانی تـرەوە، ئێـستا دەزانین کە ئێمە مردووین". زیاتر لەسەری دەڕوات و دەڵێـت: "بـا ئێـستا درکـی پـێ بکــەین کــە کەنــدەڵانی مێــژوو لــە بەرفراوانیدایــە، بــە ئەندازەیــەك هــەموو جیهــان بگرێتەخۆ، ئێمە هەسـت دەکـەین لـە شارسـتانێتییەکەدا، ئەوەنـدە لاوازی و پووچـی هەیە، لە ژیانی تاکەکاندا رەنگی داوەتەوە".

بەڵام (فولَنی) کە یەکێکە لە پیاوانی هزری ئەوروپی، لەدوای خۆیەوە تێڕامانی زۆری بەجێ هێڵاوە لەبارەی چارەنووسی شارستانێتی ڕۆژئاوا، بۆچوونەکانی ئەمیش لەگەڵ بۆچوونی (ڤالیری) یەك دەگرێتەوە، دەڵێت: "ئایا ئەو داهێنانە جوانانە چی لێهات کە دەستی مرۆڤایەتی بەدییان هێنا؟ کوا شورەکانی نەینەوا، دیوارەکانی بابل، کۆشکەکانی برسیبولیس؟ جێی نیگەرانییە، من سەردانی ئەو شوێنانەم کردووە کە جێی نمایشی هەموو ئەو شتە بەنرخ و جوانانە بوو، جگە لە تیاچوون و فەوتان هیچی ترم نەبینی. نازانم، لەوانەیە گەشتیارێکی وەك من لە داهاتوودا خۆی ببینێتەوە لای (سین) و (تایمز)، دانیشێت و بگری بەسەر پاشماوە پرش و بڵاوەکانی شارستانێتییە گەورەکەی دەوروبەری ئەم رووبارانە".

فەیلەسووفی ئەڵمانی (هیگڵ)، لە مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوای نوێدا زۆرکەس شوێنکەوتەی بوون، خاوەن ئەو بیرۆکەیەیە کە دەڵێت: هەموو گەلێك (تاکێکە لە کاروانی مێژوودا). دواتر ملکەچە وەك هەموو تاکێك بۆ یاساکانی گەشەکردن و پەرەسەندن، دواتر رووخانێکی مسۆگەر. لەگەڵ ئەوەشدا (هیگڵ) لەهەمان کاتدا وای بۆ دەچوو کە شارستانێتی ڕۆژئاوا بریتییە لە لوتکەی مێژوو، کە هیچ لوتکەیەکی تری لە دواوە نییە. گەر هەوڵمان دا تیۆرە مشتومڕئامێزەکەی لە بەدوایەکداهاتنی شارستانییەکان جێبەجێ بکەین، درك بەوە دەکەین کە ئەوانە کۆتاییان هاتووە لەژێر فشاری یاسا مسۆگەرەکاندا، یان کۆتاییان دێت، لەنێویاندا شارستانێتی ئەوروپای هاوچەرخ.

بەڵام (کۆڵن ولسۆن) لە کتێبەکەی (رووخانی شارستانییەت)، کە کتێبێکی بوێرانەیە لە بواری رەخنەگرتن لە شارستانێتیی ڕۆژئاوا، تێیدا لە مەبەستەکەی دەدوێت و دەڵێت: "وا دەردەکەوێت کە مەبەست لەم کتێبە ئەوەیە، دەمەوێ شتێك بڵێم سەبارەت بە پێویستیی ئەم سەردەمە بە ئاینێکی نوێ"، ئاماژە دەدات بەوەی کە کڵێسا پەیوەندیی بە هەموو ئەو کێشانەوە لەدەستداوە، کە لەم سەردەمەدا رووبەڕووی بوونەتەوە.

(ولْسۆن) پێیوایە هەر شارستانییەتێك رۆژێك لە رۆژان دەگاتە ساتەوەختی قەیران، شارستانێتی رۆژئاواش گەیشتۆتە ئەم ساتەوەختە، ئەم قەیرانەش هەڕەشەی لەناوچوون، یان بەرزبوونەوە بۆ شێوازێکی پایەدارتر دەکات. وەك زانراوە تا ئێستا هیچ شارستانییەك نییە تووشی ئەو رووبەڕووبوونەوەیە نەبووبێتەوەو شکستی نەهێنابێت.

مێژوو بریتییە لە لێکۆڵینەوەی ئەو پەیکەرە ئێسکیانەی کە شارستانییەتە لەناوچووەکان بەجێیان هێڵاوە، وەك ئەو پەیکەرە ئێسکیانەی کە لە ئاژەڵە لەناوچووەکانەوە ماوەتەوە، بۆ نموونە دەیناسۆر، دان بەوەشدا دەنێت کە ئایین بڕبڕەی پشتی شارستانییەتە، بەڵام لە کڵێسادا وشك بۆتەوە.

فەیلەسوفی ئەمریکی بەناوبانگ (جۆن دیڤی) دەڵێت: "شارستانییەتێك کە بوار بە زانست بدا بە رووخاندنی ئەو بەهایانەی لەسەری راهاتوون و متمانە بە توانای ئەو زانستە ناکرێت کە بتوانێت کۆمەڵە بەهایەکی نوێ بهێنێتە دی، ئەو شارستانییەتە خۆی خۆی لەناودەبات".

لە ساڵی ١٣٩٠ك– ١٩٧٠ز، (رینیە دۆبۆ) کتێبێکی بە ناوی ( So Human An Animal) دەرکرد، دکتۆر نەبیل ئەلتەویلێش بە ناونیشانی (مرۆڤایەتی مرۆڤ) کردوویەتی بە عەرەبی. دانەر زاناو وانەبێژێکی بەناوبانگە و خاون چەندین خەڵاتە لەنێویاندا خەڵاتی نۆبڵ، رۆژنامەی (ئۆبزەرڤەر)ی لەندەنی لە وەسفی کتێبەکەدا دەڵێت: "هێرشێکی تێکدەرانەیە لەسەر کۆمەڵگا پیشەسازی و بەکاربەرە نوێیەکان، بیروبۆچوونەکەی (کە مایەی نیگەرانییە) دەڵێت تاکە رێگا بۆ بەختەوەری و دەوڵەمەندبوونی راستەقینە، وابەستەیە بە زنجیرەیەك رێوشوێنی ئابووری و تەکنیکییەوە".

وەرگێڕ لە پێشەکیی چاپە عەرەبییەکەیدا دەڵێت: "پرۆفیسۆر (دۆبۆ) توندترین رەخنە ئاراستەی شارستانێتی رۆژئاوا دەکات و هێرشی سەخت دەکاتە سەر کۆمەڵگا ماددییەکەی، کە دڵەڕاوکێی بەسەردا زاڵە، نیگەرانە لە بەکۆیلەکردنی مرۆڤ بۆ

تەكنـەلۆجیا، ئـامێر بۆتـە (خوایـەكی پەرسـتراو) لـە كۆمـەڵگا رۆژئاواییەكانـدا، مـرۆڤ مرۆڤایەتی لەدەست داوەو فیترەتی وشك بۆتەوە، ژینگە پیس بووەو سروشـت وێـران بووە، شـڵەژانی دەروونـی و مێـشكیی بەسـەردا زاڵ بـووە، دوای ئـەوەی بیروبـاوەڕ و لایەنی گیانی لەدەست دا".

دواتر دەڵێت: "كتێبەكەم كرد بە عەرەبی لەبەر دوو هۆ:

**یەكەم:** گەیاندنی هەندێك لەو زانیارییانەی لە كتێبەكەدایە، بۆ ئەوانەی بانگەشـەی رۆشنبیریی دەكەن و بە كۆمەڵگای رۆژئاوا سەرسامن، بە هەردوو باڵی سـەرمایەداریی و كۆمۆنیـستییەوە. ئـەوەتا شـایەتێك لـەخۆیان شـایەتی دا، كـە رۆژئـاوا ون بـووەو بەرچـاوی روون نییـەو كارامــەیی و زرنگیــی لەدەســت داوە. ســەرۆكی شــارەوانی (كلیفلند)ی ئەمریكی، بە سوكایەتییەوە دەڵێـت: "گـەر هۆشـیار نـەبین، ئـەوا مێـژوو وەبیرمان دێنێتەوە، گوایە ئێمە ئەو نەوەیە بووین كە مرۆڤمان بـەرزكردەوە بـۆ سـەر مـانگ، لەكاتێكـدا مـرۆڤ لەسـەر زەویـدا تـا ئـەژنۆی لـەنێو قـوڕ و لیتـەو پیـساییدا چەقیوە".

**دووەم:** سەرنجڕاكێـشانی كاربەدەسـتانی جیهـانی عـەرەبی، تـا بـە بابـەتی گەشەسەندن و پەرەپێدان فریو نـەخۆن، بـەبێ لێكۆڵینەوەیـەكی قـووڵ و هوشـیاریی تەواو لـەو بـوارەدا، نەكەونـە دوای رۆژئاواییـەكان، هـەموو گەشـەكردنێك پێـشكەوتن نییە، ئـەو بـاوەڕە پڕوپووچـەی كـە دەڵێـت: "گەشەسـەندن پێـشكەوتنە"، جگـە لـە "تـەوراتێكی وێرانـی" هیـچی تـر نییـە، هـەروەك (كـۆردل هـل) وەزیـری دەرەوەی ئەمریكای پێشتر، ناوی لێناوە. هیواخواستن بـۆ هەڵوێستێكی مرۆڤانـە كـە ملكەچـی تەكنەلۆجیا نەبێت، گەڕانـەوە و شكستخواردن نییـە، بـەڵكو هەڵوێـست و توانایـەكی باڵەوانانەیە، بەپێی دەربڕینەكەی (دۆبۆ).

بـەڵام (جیبـۆن)ی مێـژوونووس، كـە بـە پێـشڕەوی لێكۆڵینـەوەی مێـژوویی نـوێ دادەنرێت، نزیكەی دووسەد ساڵە پێشبینی هەڵوەشانەوەی شارسـتانێتی ئـەوروپا و لەناوچوونە مسۆگەرەكەی لە كۆتایی سەدەی بیستدا كردووە.

(الدوس هيكسلی) پێیوایه مرۆڤ لەم سەردەمەدا شتومەك بەكارناهێنێت، بەڵكو شتەكان ئەو بەكاردێنن، بۆتە كۆیلەی كارەكانی، بەها مرۆڤایەتییەكەی خلۆر بۆتەوە، لە كەشوهەوایەكی دڵەڕاوكێدا دەژی. لە ڕۆمانێكیدا بە ناوی (ئەو پردانەی لە ڕێگای رووخاندان) لەسەر زمانی یەكێك لە كەسایەتییەكانی ڕۆمانەكەدا، ئەم دەستەواژەیە دەهێنێتەوە "لە ئامانجمدایە هۆشیارییەكی دژەشارستانیی تۆقێنەر پێكبهێنم، دەمەوێت بیسووتێنم و لەناوی ببەم".

چەندین كتێب و كاری ئەدەبی هەن، باس لە بابەتی شارستانییەتی رۆژئاوا دەكەن، وەك (شوێنە ژەهراوییەكان)ی (ترومان كابوت)، (گاڵتەجاڕی مرۆڤایەتی)ی (ولیەم سارۆیان)، (داگیركردنی نادیار)ی (میشێل رۆناڵد)، (ئەوروپای دوای باران)ی (ئالان بوزنسن) و (كاتژمێر ٢٥)ی (كۆنستانتان جۆرجیۆ)، لە نێو ئەم كتێب و كارە ئەدەبیانەدا سەركۆنە و ناڕەزایی بەرامبەر شارستانێتیی رۆژئاوا، یان رەخنەگرتن لە لایەنێك لە لایەنەكانی، یان وریاكردنەوە لەو مەترسیانەی دەوریان داوە، یان بڕیاردان لەسەر ئەوەی كە لە ڕێگای لەناوچوون و هەڵوەشانەوەدایە، بەدی دەكرێت.

(فیلا سبازا) دەڵێت: "هەموو دۆزینەوە سەرسوڕهێنەرەكانی رۆژئاوا شایستەی رژانی تنۆكە فرمێسكێك و دروستكردنی خەندەیەكیش نییە، كەس لە نەتەوەكانی رۆژهەڵات شایستەتر نین، كە پابەندن بە رۆشنبیریی عەرەبیی ئیسلامیی و هەوڵی بڵاوكردنەوەی دەدەن، بە دانانی سنوورێكی كۆتایی بۆ تێكچوونی رۆژئاوای شووم، كە مرۆڤایەتی رادەكێشێت بەرەو نشێوی تەنهایی و دەستبەسەراگرتنی ماددیی".

لە مارسی ١٤٠٢ك – ١٩٨٢ز، بڵاوكراوەی (هیراڵد تریبیۆن) وتاری پزیشكی ئوسترالی (هیلین كالدیكۆت)ی بڵاوكردۆتەوە بە ناونیشانی (دواپەتای وێرانكەر)، ئەم پزیشكە لەگەڵ پزیشكانی تردا دژی بەكارهێنانی چەكی ئەتۆمی كاردەكات. بەڕای ئەم، جەنگی ئەتۆمی كەس تێیدا باڵادەست و سەركەوتوو نییە، چونكە هەندێك لە ناوچە ئاوەدانییەكان بە یەكجاریی لەناودەچن و هەندێكی تریان مرۆڤی تێدا دەمێنێتەوەو رووبەڕووی گەورەترین مەترسی و سووتان دەبنەوە، مانەوەیان

گەورەترین بەڵایە بۆیان، بۆیە جەنگە ئەتۆمییە چاوەڕوانکراوەکانی ناونـاوە (دوا پەتای وێرانکەر)".

(ڕۆبەرت هی) مامۆستای مێژوو لە زانکۆی (مارکیت) لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا دەڵێت: "ویلایەتە یەکگرتووەکان ساڵی ١٤٠١ك – ١٩٨١ز بە ئەندازەیەك لێك هەڵوەشاوەتەوە کە بەرگە ناگرێت، ئێمـە زۆر پێویـستیمان بـە هەسـتکردن بـە ژیـانی کۆمەڵایەتی هەیە، ئاسانە کە تێبگەین (ئەمریکا) گیانەکانی ون بووە، لەوێـدا تـاك بـە هیچ شتێکەوە پەیوەست نییە، بە دوای ناسنامەکەیدا دەگەڕێت، لە کاردا، لە پیشە و پێشکەوتنی ئابوورییدا، بەدوای هێمایەکدا دەگەڕێت جیـای بکاتـەوەو پێـی بڵێـت کـە کێیە؟".

بەڵام قەشەی ناسراو (جیری فالویل) لە کتێبەکەی (ئەمریکا! گوێ بگرە) دەڵێـت: "ئاماری تۆقێنەرم لایە سەبارەت بە ڕووداوی تەڵاق و تێکدانی خێـزان و لـەباربردن و تـاوانی هـەرزەکاران و بەربـەرەڵایی سێکسی و بـەکارهێنانی مـاددە هۆشـبەرەکان و تاوانەکانی کوشتن، ئێسك و پروسکی مرۆڤەکان و گیانە بەزایـەدراوەکان دەبیـنم، بـە ئەندازەیەك لە ئامارەکان تێدەپەڕێت، ئەمریکا پێویستییەکی خێـرای بـە ڕزگـارکردنی گیان و ڕەوشتە، ئەمە ئەگەر دەیەوێت لە سەدەی بیستدا لەناو نەچێت.

# دیاردەی خۆکوشتن لە ڕۆژئاوادا

پێدەچێت راوەستان لەسەر دیاردەی خۆکوشتن لە رۆژئاوادا ئاماژەیەکی بایەخداری تایبەت بخاتە روو، کە بەڵگە بێت لەسەر حاڵەتی داماوی و بێ ئومێدیی، کە زۆرێك لە کەسایەتییە بەناوبانگەکان تێی کەوتوون، سەرەڕای کەسە سادەکان.

لە ساڵی ۱۹٤۲ز رۆماننووسی گەورە (ستیڤان زڤایج) لە بەڕازیل، لە یەکێك لە شەوە کەرنەڤاڵەکانی پڕ هەراو بەزمدا، کە (ریودی جانیرۆ) ئاهەنگی تێدا دەگێڕا، خۆی کوشت، ناوبراو لەگەڵ هاوسەرەکەیدا ژەهری خوارد و مرد، دوای ئەوەی لە یەکێك لە دوایین چیرۆکیدا نووسیبووی: "ئەو جیهانەی تێیدا دەژین نەیتوانی شتی زۆرمان پێ ببەخشێت، لە هەمان کاتدا ناتوانین بەشداریی بکەین لە گۆڕینی هیچ شتێکدا، ئێمە لە تارمایی و بیرەوەریی زیاتر نین".

لە ساڵی ۱۹٤۹ز ئەدیبی ئەڵمانی (کلاوس مان) کوڕی نووسەری بەناوبانگ (تۆماس مان) لە شاری (کان)ی فەڕەنسی خۆی کوشت. باوکی لە پیاهەڵدانیدا، یادی هاوڕێکەی (ستیڤان زڤایج) دەکاتەوە، وەك ئەوەی لە هۆکاری خۆکوشتنی ئەدیبەکان بپرسێت، جا هۆکاری خۆکوشتنەکان لە دابڕان و گۆشەگیریی ئەدەبی و فیکری و هەستکردن بە نامۆییدا دەدۆزێتەوە.

لە ساڵی ۱۹٥۰ز لە یەکێك لە ئوتێلە سادەکانی شاری (تۆرینۆ) دوای ئەوەی گەیشتە لوتکەی ئەدەبی ئیتاڵی، ئەدیبی ئیتاڵی (سینزر بافیزە) خۆی کوشت، دوای بڵاوبوونەوەی رۆمانە درێژەکەی (پیشەی ژیان) کە بۆنی مەرگ و خۆکوشتنی لێ دێت.

لە ساڵی ۱۹٦۱ ز جیهان هەژا بە خۆکوشتنی ئەدیبی ئەمریکی ناسراو (ئێرنست هەمەنگوای)، ناوبراو بە دەستی خۆی کۆتایی بە ژیانی خۆی هێنا، دوای ئەوەی لە ناوبانگی ئەدەبیدا، لە ناوخۆ و دەرەوەی ئەمەریکادا، گەیشتە ریزی ئەدیبە جیهانییەکان.

له ساڵی ١٩٧٨ز نووسەری فەڕەنسی (جان ئیمری) خۆی کوشت، کە بە درێژایی ژیانی پابەند بوو بە ئەدەبی مردنەوە، وەك شوێنکەوتنێکی ئیلهام بەخشە فیکرییەکەی، کە (هاینریش فون کلایست) بوو، ئەویش لە ساڵی ١٨١١دا خۆی کوشتبوو.

دەکرێت (جان ئیمری) بە بەتواناترین نووسەر و ئەدیبی ئەورووپی دابنرێت لە دەربڕینی ئەدەبی خۆکوشتندا، کە ناوی لێناوە (إمتیاز الإنسان)، کاتێکیش قوتابییەکانی پرسیاری گاڵتەئامێزیان ئاڕاستە دەکرد، سەبارەت بەو هۆکارەی کە رێگرە لە خۆکوشتنی، کە هەر خۆی کتێبێکی داناوە بە ناوی (چەند وانەیەك لە بارەی خۆکوشتن)، وەڵامی قوتابییەکانی دەدایەوە بە وتەکەی (ئارام بگرن ئەی هاورێیان ئارام). لە ڕۆژی کردنەوی پێشانگای کتێبی نێودەوڵەتی لە شاری فرانکفۆرد، ساڵی ١٣٩٨ ك/ ١٩٧٨ز دا، (جان ئیمری) خۆی کوشت و ئەوەی کە پێشتر دەیوت بەسەر خۆیدا جێبەجێی کرد.

له ساڵی ١٩٨٠ز شاعیری ئەڵمانی دکتۆر (هانس بایر)، کە لە شیعرەکانیدا بە ناوی (ترۆڵ)ەوە ناسراو بوو، زێدەڕۆیی کرد لە ئاهەنگی خۆکوشتنیدا، لە ساڵیادی (٦١)هەمینی لەدایکبوونیدا، حەبێکی زۆری خەولێخەری خوارد، دوای ئەوەی جلە تازەکانی پۆشی و گوڵی بەسەر ئەو نوێنەیدا پرژاند کە لەسەری پێشوازی مەرگی دەکرد. لە بیری نەچوو پێش مردنەکەی پرسەنامەکەی بنێرێت بۆ هاوڕێکانی و تێیدا بنووسێت: "هاوڕێیانی ئازیز، پێش مەرگم، مەراسیمی پوچی ناشتن و بینینی بەرێکەرانی مردوو و کەشوهەوای ساختەی دەوروبەری تەرمەکانم سازدا".

لە ساڵی ١٩٨٣ز خزمەتکارەکەی نووسەری بەناوبانگی بەریتانی (ئارسەر کۆستلەر) چووە ژووری دانیشتنی گەورەکەیەوە، بینی لەسەر کورسییە چاکەکەی، کە خوێندنەوەی تێدا دەکرد، لە تەنیشت خێزانەکەیەوە دانیشتووە، هەردووکیان مردبوون و خۆیان کوشتبوو.

گۆڤـاری (تـایم)ی ئـەمریکی خۆکوشـتنی (کۆسـتلەر) و نووسـینی پێـشەکیی نامیلکەیەکی بچووك بە ناوی (رێبەری رزگارکردنی خود)، پێکەوە دەبەستێتەوە، ئەم نامیلکەیە سـاڵی ١٤٠١ك/ ١٩٨١ز، لـە لایـەن کۆمـەڵێکی بەریتانییـەوە دەرکـراوە، کـە هەشت هەزار ئەندامی هەیە، رێبەرەکە چـەندین شـێوازی خۆکوشـتن لـەخۆ دەگرێـت. ئەم رێبەرە نامۆیە، وەك گۆڤارەکە دەڵێت، یەکێکە لە چەندین بەڵگەی هاوشێوە، کـە لە ئەوروپا و ئەمریکادا بە چەندین زمانی جۆراوجۆر بڵاوبۆتەوە، لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئەو کۆمەڵانەی هانی خۆکوشتن دەدەن، کە لە (١٨) کۆمەڵە زیاترن.

لـە پوختـەی ئامارەکـان لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، سـاڵی ١٩٨٤ز خشتەیەك سەبارەت بە خۆکوشتن و رێژەکەی لـە نێـوان هـەر (١٠٠) هـەزار کەسـێکدا بڵاوکراوەتەوە، دانیمارك لە پلەی یەکەمدایەو ئینجا نەمسا و دواتر ئەڵمانیای رۆژئـاوا، سویسرا، سوید، ژاپۆن، فەڕەنسا، کەنەدا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

ئەوەی جێگـای سـەرەنجە خـەڵکی ئـەم وڵاتانـە زۆربـەیان لـە ئاسـتێکی ئـابووریی بەرزدان و هەندێکیان لە ئاسوودەییدا دەگەنە پلەی خۆشگوزەرانی، لەگـەڵ ئەوەشـدا دەبینین بە رێژەیەکی زۆر خۆیان دەکوژن، وا دەکات هەر توێژەرێك بە سوور بـوون و پێداگیرییەوە بپرسێت: بۆچی خۆیان دەکوژن؟

رەنگە هەموو تا ئێستا رووداوی خۆکوشتنی نزیکەی هەزار ئەمریکی لـە یـاد بێـت، کـە لـە یـەکێك لـە دەوڵەتـەکانی ئـەمریکای لاتینیـدا لـە کۆتـایی حەفتاکانـدا، ئەمانـە هەموویان بـە هـەردوو رەگـەزەوە لاو بـوون، بـە دووی کەسـێکی شـێتۆکەو خەڵـەفاو کەوتن، بە پاسـاوی ئامـادەکردنی گیانـەکان و شـتی تـر، لەوێـدا ژەهریـان بـۆ دانـرا، هەموویان کوپەکەیان لەیەك کاتدا نۆشی، تەلەفزیۆنی ئەمریکی فرۆکە ئەمریکییەکانی پیـشان دەدا، کـە لاشـەی کوژراوەکـانی دەسـپاردەوە بـە کەسـوکارە شـڵەژاوە بێهۆشەکانیان.

رووداوێك، بێگومان پێویستە هەر توێـژەرێك لەسـەری راوەسـتێت، سـەبارەت بـەو ئایندەیەی کە شارستانییەتی رۆژئاوای لەسەر دەڕوات، ئەم رووداوە دەوڵەمەنـدە بـە

چەندین بەڵگەو وانە. لە ساڵی ١٩٧٧ز لە شاری نیویۆرك بۆ ماوەیەکی درێژ تەزووی کارەبا بڕا، لە کاتی تاریکیدا چی روویدا؟ کاتێك چاودێریی ون بوو، ئەمن و ئاسایش نەما، پۆلیس دەستەوەستان بوو لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیاندا، دزین و تالآنکردن، کوشتن، توندوتیژی و وێرانکردن روویدا، بە رێژەیەك چەند جار زیاتر بوو لەوەی لە کاتی ئاساییدا روودەدات، کاتێك پاڵنەری دەرەکیی رێگر لە خراپەکاریی نەما، بە روونی دەرکەوت کە پاڵنەری نێوخۆیی زۆر لاوازە، ئەدەب لە مامەڵەکردن، وێنەیەکی شارستانی بۆ پێکەوەژیان لەگەڵ کەسانی تردا، ئەدەبێکی درۆ و وێنەیەکی ساختە بوو. رووکەشی ساختە رووخا و توێکڵی جوانی درۆزنانە کەوت، دڕندەیی راستەقینە لە ناخی خەڵکەکەدا دەرکەوت، ئەوەبوو دەستیان کرد بە کوشتن و وێرانکردن و دزین و تێیاندا هەبوو دزیی نەدەکرد، تا بیتوانیبایە وێرانیی دەکرد، ئینجا ئەوەی دەدزی کە دەیویست بیدزێت، هەبوو چێژی لە وێرانکردنی شوێنە بازرگانییەکان و ئازاردانی دراوسێدا دەبینییەوە.

(نیکسۆن) پێی شەرم نەبوو کە لە یەکەم وتاری رەسمییدا، دوای هەڵبژاردنی بە سەرۆکی ئەمریکا، رایبگەیەنێت: "ئێمە خۆمان لە شتومەکدا دەوڵەمەندین، بەڵام لە گیاندا پارچە پارچەین، بە وردییەکی جوان دەگەینە سەر مانگ، بەڵام لەسەر زەویدا لە نێو شتی خۆڕایی و بێ سەروبەر و پەلەقاژێ و ماندووبونێکی گەورەداین".

بەڵام (دیگۆل) سەرۆکی پێشتری فەرەنسا وتوویەتی: "کۆمەڵگا ئەوروپییەکانمان لە ژێر فشاری پێشکەوتنە گەورەکەیدا، شتێکی زۆر بەنرخی لەدەستداوە، ئەویش مرۆڤایەتییە، مەبەستیشم لێی بەها گیانییە مرۆڤایەتییە بەرزەکانە، شارستانیەتییەکەمان ئەو پەیوەندییە مەعنەوییەی پچڕاندووە کە مرۆڤەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، هەستەکانمان وشك بوون، بەها رەوشتییەکانمان تووشی بەستن و هەڵوەشانەوە بوون".

کاتێك پرسیار لە (دیگۆل) کرا سەبارەت بە حەزەکانی لە پتەوکردنی پەیوەندیی وڵاتەکەی لەگەڵ جیهانی عەرەبیی و ئیسلامییدا، لە وەڵامدا وتی: پێموایە

پەیوەنـــدییکردنمان بـــە کۆمـــەڵگای عـــەرەبی و ئیـــسلامییەوە، کـــە ئـــەو گیانـــە مرۆڤایەتییـــەیان پاراســـتووە، کـــە ئێمـــە لەدەســـتمان داوە، رزگارمـــان دەکـــات لـــە گەمژەییـــەکانی شارســـتانییەتەکەمان و زۆر بەســـوود دەبێـــت بۆمـــان، مـــن زۆر ســـوورم لەســـەر چـــاککردن و پتـــەوکردنی پەیوەندییـــەکانی فەرەنـــسا بـــە جیهـــانی عـــەرەبی و ئیسلامییەوە".

دیگۆل لە چەندین بۆنەدا ئەو هەستەی خۆی راگەیاندووە، کە یەکێتی سۆڤیەت بـە چەندین کێشەوە گرفتـارە، لاشـەکەی کرمـۆڵ دەکـات، رۆژێـك دەبێـت دەتەقێتـەوە، ئەمریکاش بە کێشەی هاوشێوە گرفتارە، پرسـیار دەکـات کـە ئایـا دەشـێت ئیـسلام چارەسەر بخاتە ڕوو بۆ تیمارکردنی دەردەکانی شارستانییەتەکە؟

لـەو دەنگـە دیارانـەی کـە پێویـستە زیـاد لـە حاڵـەتی ئاسـایی لـە گۆڕەپانـە فیکرییەکەیـدا راوەسـتین، فەیلەسـووفی فەرەنـسی هاوچـەرخ (گـارودی)یـە، نـاوبراو کەسایەتییەکی رامیاریی و رۆشنبیریی بەناوبانگە، نـەك تـەنها لـە فەرەنـسادا، بـەڵکو لەسـەر گۆڕەپـانی جیهـانی. ئـەم پیـاوە ژیـانێکی بـە پیـت و دەوڵەمەندانـە ژیـا، لـە کۆمەڵگای فەرەنسیدا پێگەیشت، خـۆی بینییـەوە وەك یـەکێك لەوانـەی بـە مـیرات و راهاتن ئاپینی مەسیحی هەڵگرتووە، زیاتر لەوەی قەناعەت و پابەنـدبوون بێـت، بۆیـە نامۆ نەبوو کە وازی لە مەسیحیەت هێنا و کۆمۆنیستیی هەڵبژارد، لە حیزبـی شـیوعی فەرەنـسییدا پایەیـەکی بـەرزی فیکـری و رێکخـستنی هـەبوو، دانراوەکـانی لـە نێـو شیوعییەکاندا دەستاودەستی پێ دەکرا، بەڵام وردە وردە رەخنەی لـە شـیوعییەکان دەگرت، لە وتارەکانیدا بانگەشـەی دەکـرد بـۆ ئـەوەی مارکـسیەت فەلـسەفەکەی بـە بەخششی ئاینییەکان بە گشتی و ئیسلام بەتایبەتی بپیتێنێـت، گـەر نـا ئـەوا بڕیـاری نەزۆکیی بەسەر خۆیدا داوە، ئەم دەستپێشخەرییەی بووە مایـەی قـەیران و دژایـەتی لە لایەن هاوڕێکانیەوە، تا ئەوەی یەکێك لە هاوڕێکانی کتێبێکی دژی نووسی بە نـاوی (فەلسەفەی هەڵگەڕانەوە).

(گارودی) بەردەوام بوو لە گەڕاندا بە دووی ڕاستییەکان و بـە دووی دیراسـەکردنی ئیسلام، تا ڕاسـتییە درەوشـاوەکانی ئیـسلامی بـۆ دەرکـەوت، کـە پێداویـستییەکانی مـرۆڤ لـەخۆ دەگرێـت، تـاك بـن یـان کۆمـەڵ، ئـەوە بـوو سـاڵی ١٤٠٢ ك / ١٩٨٢ ز مسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند، ناوبراو گۆڕا بە ڕەخنەگرێکی بینا بۆ کەموکورتییەکانی شارستانییەتی ڕۆژئاواو بـووە بانگخوازێـك بـۆ ئیـسلام و بـەرگریکارێك بـۆ کێـشەکانی عەرەب و ئیسلام و مژدە دەرێ بەوەی ئیسلام دەتوانێت شارستانیەتیی لەو مەینەتی و دەردەسەرییە دەرهێنێت، کە ئەمڕۆ تێیدا دەژی.

(ئەلێکسیس کاریل) کتێبەکەی (مرۆڤ ئـەو نادیارەیـە) کـردە دیـاریی بـۆ (ئەوانـەی ئازایـەتی پێویـست لەخۆیانـدا دەبیـنن، تـا درك بـەوە بکـەن، نـەك تـەنها ڕوودانـی گۆڕانکـاریی عـەقڵی و سیاسـی و کۆمەڵایـەتی پێویـستە، بـەڵکو سـەرەوژێر کردنـی شارستانێتی پیشەسازی و دەرکەوتنی بیرۆکەیەکی تر بۆ پێـشکەوتنی مرۆڤایـەتییش پێویستە).

بە ڕاستی (گـارودی) ئازایەتییـەکی تـەواوی هـەبوو، تـا سـەرەتا مـسوڵمان بـوونی ڕابگەیـەنێت و دووەم جـار بڕیـار بـدات کـە ئیـسلامە هـەموو شارسـتانییەکان ڕزگـار دەکات، وەك ئەوەی (بیرۆکەیەکی تر بێـت بـۆ پێـشکەوتنی مرۆڤایـەتی) کـە (کاریـل) بانگەشەی بۆ دەکرد.

(گارودی) ئەو ئاماژانەی کە مرۆڤایەتی لە فەوتان و لەناوچوون ئاگادار دەکاتـەوە، لە ژێر سایەی شارستانییەتی ڕۆژئاوادا، بە چوار خاڵ دیاریی دەکات:

١ـ ئەو ئابوورییەی گەشەکردنێك بە سەریدا زاڵە، کـە خـۆی لـە حـەزێکی شـێتانەدا دەبینێتەوە، لە زیادکردنی بەرهەم و خێراییەکەی، بەرهەمهێنانی هەر شتێك، بەسوود بێت یان بێسوود، زیانبەخش یان لەناوبەر.

٢ـ ئەو سیاسەتەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە نێوخـۆیی و دەرەکییـەکان بـەڕێوەی دەبات، توندوتیژییەك بەسەریدا زاڵە، کە ڕەنگدانـەوەی تێکگیرانـی بەرژەوەندییەکانـە، ململانێکردن بۆ دەستبەسەراگرتن لە نێوان تاکەکان و چینەکان و نەتەوەکاندا.

٣ـ رۆشنبیرییەکی خاڵیی لە مانا و ئامانج، تەکنیك بۆ تەکنیکە، زانست بۆ زانستە، هونەر بۆ هونەرە، ژیانیش بۆ ئامانجێك نییە.

٤– بیروباوەڕێکی خاڵیی لە بەرزی و شکۆیی کە ڕەنگدانەوەی ڕەهەندی مرۆڤایەتی مرۆڤە.

(گارودی) لە چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەوانیدا کە لەگەڵی ئەنجام دراوە، دەڵێت: "پیشەسازیی چەك بەسەر جیهاندا زاڵ بووە، لە ساڵی ١٤٠٢ ك / ١٩٨٢ ز، جیهانی رۆژئاوا (٦٥٠) ملیار دۆلاری لە خۆپڕچەککردندا خەرج کردووە، کە یەکسانە بە چوار تۆن تەقەمەنی بۆ هەر مرۆڤێك لەسەر زەویدا، بە واتایەکی تر، بۆ یەکەمجار لە مێژوودا، دەکرێت هەر شوێنەوارێکی ژیان لەسەر زەویدا بسڕێتەوە. هەروەها لە هەمان ساڵدا (١٩٨٢ ز)، (٥٠) ملێون مرۆڤ لە جیهانی سێیەمدا هەبوو، کە بە دەست برسێتی و ژیان و گوزەرانی خراپەوە دەیاننالاند. گەر ئەمە بەڵگە بێت لەسەر شتێك، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیهان بە ڕێگایەکی سەرلێشێواودا، بێ بیرکردنەوە لە دەرەنجام، دەڕوات. کێشەکە ئەوەیە چۆن جیهان رزگار بکەین؟ چۆن لە شارستانییەتی رۆژئاوا رزگارمان بێت؟ چۆن ڕێگایەکی دانایانە هەڵبژێرین تا مرۆڤ بتوانێت لەلایەکەوە بە گونجاویی لەگەڵ سروشتدا بژی و لەلایەکی ترەوە لەگەڵ مرۆڤەکانی تردا بژیی؟ ئینجا بە گونجاوییەکی تەواو لەگەڵ خوای گەورەدا. گەیشتن بە وەڵام، مەبەستی سەرەکییە لە گفتوگۆی شارستانییەتەکاندا".

رۆژنامەی (نیویۆرك تایمز) لە ژمارەکانی مانگی شوبات و ئازاری ساڵی ١٩٨٢ ز، زنجیرە توێژینەوەیەکی بڵاوکردۆتەوە، سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی تاوان و تێکدانی خێزان و راکردنی هەرزەکاران و دەرکەوتنی نەخۆشی (هەربیز)، تیایدا وتوویەتی: "دەرکەوتووە ئەو دامودەزگا چاکسازییانەی هەوڵی چاککردنی ئەو هەرزەکارانە دەدەن، تەنها قوتابخانەیەکن فێری تاوانیان دەکەن، کە راهێنان بە یەکتر دەکەن لەسەر شێوازەکانی کوشتن و دزی و بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان و سێکس. ئەم دامودەزگایانە، دۆش داماون و سەرسامن سەبارەت بەم بابەتە".

چەند ئامارێك سەبارەت بە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڵاو کرایەوە، بە بۆنەی هەوڵی کوشتنی سەرۆکەکەیان (ریگان)، تێیدا هاتووە، کە لە هەر ٢٤ خولەکێکدا تاوانێکی کوشتن ئەنجام دەدرێت، لە هەر (١٠) چرکەیەکدا چوونە سەر ماڵ و دزییەك روو دەدات، بڕی ئەو چەکانەی خراونەتە روو بۆ فرۆشتنی ئازاد، دەمانچەیەکە بۆ هەر چوار کەسێك، هەر (١٣) چرکەیەك پارچە چەکێك دەفرۆشرێت.

(جۆزیف کامی لیری) لە کتێبەکەیدا (قەیرانی شارستانی)دا، بە دەستێکی سەرکێشی چەسپاو، توێکاری لاشەی شارستانێتی پیشەسازیی و رۆشنبیریی رۆژئاوا دەکات و دەردە کوشندەکانی دەدۆزێتەوە، کە پێوەی دەناڵێنێ، هەروەك دکتۆر (فیصل السامر) وەرگێڕی کتێبەکە بۆ عەرەبی، گوتوویەتی.

ئەو تەکنەلۆژیایەی دەبوو مرۆڤ رزگار بکات لە کۆیلایەتیی شێوازی کۆنی ئابووریی، ئەمڕۆ بۆتە سەروەریی مرۆڤەکان... ئەو قوتابیەی روو دەکاتە ماددە هۆشبەرەکان، ئەو هیپیەی بە دووی فیردەوسێکی فریودەردا رادەکات، ئەو هەرزەکارەی هەوڵی شکانی پەنجەرەکان و تێکدانی ئۆتۆمبیلەکان دەدات، بێدارێك، هەڵاتنی خۆی لە شێتی و شڵەژان لە بەکارهێنانی کحولدا دەبینێتەوە، هەموو ئەوانە قوربانیی کەشوهەوایەکی شلۆق و هەستکردن بە نەبوونی دڵنیایی و نەخۆشیی سەخت و ئاڵۆزن. مەترسیی ئەم قەیرانە بەردەوامە لەوەدایە کە تەنها روو ناکاتە لایەنی گیانیی مرۆڤەکان، بەڵکو پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکان هەرهەمووی دەپوکێنێتەوە، کەسایەتی مرۆڤ بۆتە قوربانیی ناهاوسەنگی. پێویستە مامەڵە لەگەڵ ژینگەی سروشتیدا بکات، لەبەر ئەوەی ئامێری ئابووریی بۆ ئەوە پاڵی پێوەدەنێت، لەپێناو بەرهەم و بەکارهێنانی زۆرتر، بە مەبەستی زامنکردنی خووڵی ئابووریی، لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە نێو ئەم هاوکێشە ناهاوسەنگەدا، درککردنی بە رۆڵی تایبەتی و ئامانجەکانی لە بوونەوەردا، هەروەها ئەرکەکانی بەرامبەر بە خۆی و هاوڕەگەزەکانی و ژینگەکەشی، لەدەست داوە.

# هەوڵدانی پێنەگەیشتوو

لەگەڵ کۆدەنگیی ژمارەیەك کە بە کەم دانانرێت، لە بیرمەنـدانی ئـەورووپی، لەسـەر ئەوەی شارستانییەتی رۆژئاوا لـە رێگـای لەناوچـووندایە، زۆرێـك لەوانـە باسـیان لـەو هۆکارانە نەکردووە کە سنوورێك بۆ ئەم شارستانییەتیە ماددییە زەبەلاحـە دادەنـێ و ئـەو سـیما خوازراوانـەی جێگرەوەکـەی دەبـێ چـۆن بێـت، تـا بتـوانێ سـەرلەنوێ رابەرایەتی شارستانیی بەدەستەوە بگرێت.

راسـتە (ئەلێکـسیس کاریـل) تـا رادەیـەکی زۆر لـە دیـاریکردنی نەخۆشـییەکە سەرکەوتوو بوو، بەڵام شارەزا و بەهرەمەند نـەبوو لـە دیـاریکردنی چارەسـەردا، ئـەو هەر ئەوەنـدە خوازیـاری بەرنامەیەکـە مرۆڤایـەتی رزگـار بکـات، بـەڵام لـە سەرچـاوە رەسـەنەکەیەوە نـەبێت، ئـەو بەرنامەیـەکی دەوێـت تیایـدا (مـرۆڤ پێـوەری هـەموو شتەکان) بێت، نامۆ نەبێت لەو جیهانەی کە دایهێناوە (ئـەو بەرنامەیـەی لەسـەر ئـەو نەفامیەی چەسپێنراوە بە تایبەتمەندیی و بنەماکانیەوە هەڵناسێتەوە). بەرنامەیـەکی دەوێـت ژینگەیـەك دروسـت نـەکات کـە (گونجـاو نـەبێت لەگـەڵ توانـاو شـێوەمان) و وانەکات (لـە رووی رەوشـتی و عەقڵییـەوە دواکـەوین)، کەسـایەتی تـاك لـە حـسابیدا نەسڕێتەوە، بەڵام پێویستیی تاك بـۆ ژیـانی بەکۆمـەڵ لـەبیر ناکـات، ئـەو بانگەشـەی پێویستیی (هەڵگێڕانەوەی شارستانیی پیشەسازی و دەرکـەوتنی بیرۆکەیـەکی تـر بـۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی) دەکات، بەڵام بەدووی بەرنامەکەیدا دەگەڕێت کـە هاوشـان و تەریبی چەند لایەنێکی راستێتی لای مرۆڤ بێت، ناوبراو وای دەبینێتـەوە کـە هۆکـاری ناڕەحەتی و کارەسات بریتییە لە بایەخنەدان بـە زانـستەکانی ژیـان، دەڵێـت: "ئێمـە قوربانیی دواکەوتنی زانستەکانی ژیانین لەسەر حسابی زانستی بێگیانەکان".

بەڵام (دالاس) بە دووی بەرنامەیەکدا دەگەڕا (کـە هەوڵێـستێکی تەمومـژاویی نییـە بەرامبەر بە ئیمان و پەیوەندیی بـە چـالاکیی زیندەگییـەوە)، بەرنامەیـەك (جیـاوازیی ناکات لە نێوان ئایین و پیادەکردنی ئاییندا، پەیوەندیی نێوان ئیمان و کار ناپچڕێنێت

و تێکی نادات، پێیوانییه که ئیمان لەگەڵ بارودۆخی نوێدا ناشێت)، ئەو بەرنامەیەکی دەویست (یەکەمایەتی شتە ماددییەکان رەت بکاتەوە، خۆشگوزەرانیی ئابووریی لەسەر حیسابی لایەنی گیانی و ژیری رەت بکاتەوە).

(دالاس) داوای ئەم بەرنامەیە لە پیاوانی کەنیسەی ئەمریکی و سەرکردە رۆحییەکانی وڵاتەکەی دەکات، هیوادارە چارەسەر و رزگاربوون لە لای ئەوان بدۆزێتەوە.

بەڵام ئەوەی کە پێویستە روون بێت، کە نە (مرۆڤ زانی) دەتوانێت بە دەم هاوارەکەی (کاریل)ەوە بچێت و نە کەنیسەو باوکە رۆحییەکانی دەتوانن بە دەم هاواری (دالاسەوە) بچن.

گەر دەستەوەستانی شارستانێتی رۆژئاوا لە بەدیهێنانی ئاواتی مرۆڤایەتی دا، بووبێتە ئەمری واقع، ئەگەر ئەو بەرنامە زەمینییانەی بیرمەند و ژیرەکان لە قوربانیانی شارستانییەتی رۆژئاوا ئاماژەی پێ دەکەن، دەستەوەستان وەستابن بەرامبەر ئەم هەرەس و رووداني کارەساتە، ئەی جێگرەوە لە کوێیە؟

# جێگرەوە لە کوێیە؟

شارستانیی رۆژئـاوا بـە هـەردوو باڵەکەیـەوە (سـەرمایەداریی و مارکسی) لـە یـەك سەرچـاوەوە ئـاو دەدرێـن، کـە بریتییـە لـە هـزری مرۆیـی، هـیچ پەیوەندییـەك نایبەستێتەوە بە هۆکارەکانی ئاسمان، جیاوازیی نییە کە بکەویتە نێو چڵکاوەوە بـە دەستە راستدا یان بە دەستە چەپدا، بۆیە پێشکەشکردنی چارەسەر بـۆ رزگـارکردنی مرۆڤایـەتی لـە ئـەمریکا و روسـیا و ئەوانـەی لـە خولگەیانـدا دەخولێنـەوە، کـارێکی خوازراو نییە.

گەر ئاوڕمان داوە بە لای چیندا (بەوەی یەکێکە لـە دەوڵەتـە گـەورەکان) دەبیـنین ئەو پردە سوورانەی کە بە سەربازگەی رۆژهەڵاتی دەبەستێتەوە، دەستی بە رووخـان کـردووە، تـا لـە بریـدا پـردی تـر دروسـت بێـت و ببیەسـتێتەوە بـە جیهـانی سەرمایەدارییەوە، ئەمەش مانای وایە چین لەو نێوەندەدا ئەمبـەرو ئەوبـەر دەکـات و نـەیتوانیوە نموونەیـەکی نـوێ بێـت و بکرێـت ئامـادە بکرێـت وەك جێگرەوەیـەکی شارستانی یان بناغەیەك بۆ جێگرەوەی شارستانی.

سـەبارەت بـە ژاپـۆن، هـیچ خولیایـەکی رابەرایـەتیکردنی نییـە لـە میانـەی بـەهاو رێبازی فیکرییدا، نزیکە لە نوێنەرایەتیکردنی شارستانیی رۆژئاوای ماددیی، کـە بۆتـە نەفرین بەسـەر خاوەنەکەیـەوە، لەوانەیـە چـێژی پێـشکەوتنی تـەکنۆلۆژیی سـەرقاڵی کردبێت لە بیرکردنەوە لە رابەرایەتیکردنی ئاسۆکانی جیهانی، مەگەر تەنها لە میانەی ناردنـەدەرەوەی بەرهەمـە پیـشەسازییەکان، کـە خـودی بـازاڕی رۆژئاواشـی داگـیر کردووە.

هیندیش هەرچەندە توانای زۆری لەبەردەستدایە، بەڵام نابێتـە دەوڵـەتێکی زلهێـز، زۆر لـەوە دەستەوسـتانترە ببێتـە جێگرەوەیـەکی شارسـتانیی، بـەهۆی بیروبـاوەڕە ئاییـنییـە دواکـەوتووە نەرێنییـەکانی، کـە بەسـەر زۆربـەی نەوەکانیـدا زاڵـە، بـەهۆی لێکدوورکەوتنەوەی گەلەکەی، یان چاکتر بڵێین گەلەکانی.

جگە لە مسوڵمانان لە گۆڕەپانەکەدا کەسی تر نەماوە، هیچ بەرنامەیەکیش نەماوە جگە لە ئیسلام، سەرەڕای ئەوەی رابردوویەکی پرشنگداری هەیە لە بەدیهێنانی هەموو ئەوانەی مرۆڤایەتی لە بەرنامە دەسکردە زەمینیەکان دەستەوستان بوون لە جێبەجێکردنی.

بەڵام رۆژئاوا نایەوێت ئیسلام بەرنامەی رزگارکەر بێت، لەگەڵ ئەوەی ئەو سیفەتانەی هەریەك لە (کاریل) و (دالاس) داوای دەکەن لە رزگارکەردا هەبێت، لە هیچ کەسێکدا نییە، تەنها لەم ئاینەدا نەبێت. ئەو بەرنامەیەی پیایدا هەڵدەدەن، لەنێو هەموو بەرنامەو رێچکەو تیۆرەکانی، کە نەوەی مرۆڤایەتی پێی ئاشنایە، تەنها لە ئیسلامدا هەیە.

ئەگەر دروستکەرانی شارستانیی رۆژئاواو ئەوانەی لە سێبەری دان مایەپووچیی خۆیان راگەیاند، مرۆڤایەتییان بەرەو تیاچوون برد. گەر ئێمەی مسوڵمان وادەبینین کە ئیسلام تاکە شیاوێکە بۆ وەرگرتنی سەرکردایەتیکردنی مرۆڤایەتی، ئایا لە نێو سەرکردەکانی رۆژئاوا و سیاسییەکان و بیرمەندەکان، ئەوانەی کە پێشبینی رووخانی شارستانیی رۆژئاوا دەکەن، ئایا پێشبینی شایستەیی مسوڵمانان دەکەن بۆ رابەرایەتیکردن و پێشبینی ئەوەی کە رۆڵی گرنگیان هەبێت؟

لەوانەیە لە گرنگترین ئەوانەی لەم بوارەدا وترابێت ئەوەیە کە زانای رووسی (ترۆجانسوکی) وتوویەتی، ناوبراو لە دوای شۆڕشی پیشەسازیی کۆمەڵێك دانراوی نووسی و هەوڵی تۆکمەکردنی دەدا، دەیپرسی: کەی و لە کوێوە شۆڕشی جیهانی سێیەم دێت؟ بەمە ئاماژەی دەدا بە هەردوو شۆڕشی جیهانی فەرەنسی و کۆمۆنیستی و شکستیان لە چەندین بواردا. جیهان پێویستی بە شۆڕشی ئایندە هەیە تا بتوانێت ڕەوتی بزاڤی مرۆڤایەتی راست بکاتەوە، دەڵێت: ئەم شۆڕشە نایەتە ئاراوە تەنها لە جیهانی ئیسلامییدا نەبێت، ئەمەش لە ساڵی ١٩١٩ز.

لەوانەیە کتێبی (ئیسلام هێزی سبەینێی جیهانە)، وردترین ئەوانە بێت کە نووسراون سەبارەت بەوەی رەگەزی تواناو هێزێکی زۆر لە ئیسلامدایە، دەتوانێت

هێزێکـی جیهـانیی دروسـت بکـات، دانـەری کتێبەکـە (بـاول شمتـز)ە، مەبەسـتی بەرچـاوڕوونکردنی هاوڕەگەزەکانیـەتی بـە رەگـەزەکانی هێـز لـە ئیـسلامدا و ئاگادارکردنەوەیان لەو هێزە.

ناوبراو دەڵێت: رەگەزەکانی هێزی بنەڕەتی، کە مسوڵمانان هەیانە، چوارن:

**یەکەم:** پێگەی ستراتیژیی کە مسوڵمانان لە جیهاندا هەیانە، ئەمە شوێنێکی گرنگە بە شایەتیی (شمتـز) و شـایەتیی زۆرێکـی تـر. ئـەم شـوێنە پێگەیـەکی نـاوازە لـەخۆ دەگرێت. بە درێژایی مێژوو چاوی تێبڕدراوە، لە لایـەن سـەرکردەکان و رزگارکـەران و ئیمپراتۆرەکـان و ئەوانـەی دەوڵـەتیان دامەزرانـدووە. بێگومـان ئـارەزوو بـۆ دەستبەسـەراگرتنی ئـەم شـوێنە ناوازەیـە یەکێکـە لـە هۆکارەکـانی پـشت بزاڤـی خاچپەرستان و بزاڤی داگیرکاریی و پەلاماری زایۆنیی ئێستا.

**دووەم:** گەشەکردنی مرۆیی لای مـسوڵمانان، بەڵگەیـە لەسـەر بەپیتییـەکی گـەورە لای مـسوڵمانان، بەشـێوەیەك رێـژەی زۆربوونیـان زۆر زیـاترە لـە رێـژەی زۆربـوونی کەسانی تر. (شمتز) دەڵێت: "دیاردەی گەشەکردنی دانیشتوان لە وڵاتانی رۆژهـەڵاتی ئیـسلامیی ئامـاژە بـە ئەگـەری روودانـی بومەلەرزەیـەك لـە تـەرازووی هێـز لـە نێـوان رۆژهەڵات و رۆژئاوادا دەکات. توێژینەوەکان بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی لای دانیـشتوانی ئەم ناوچەیە بەپیتیی مرۆیی، زیاترە لەو رێژەیەی لای گەلانی ئەوروپا هەیە".

ئـەوەی راسـتیی ئـەم پێـشبینییانە دەسـەلمێنێت لـەم بـوارەدا زۆربـوونی چاوەڕوانکراوی دانیشتوانی وڵاتە ئیسلامییەکانە، لەگەڵ مانەوەی وڵاتانی رۆژئـاوا بـە پارێزگاریکردنی رێژەی دانیشتوانی، جگە لە جیاوازیی جۆری دانیـشتوان، کـە رێـژەی لاوان لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا زیـاد دەکـات و بـە پێـچەوانەوە لـە کۆمـەڵگای رۆژئـاوا رێژەی پیر و بەساڵاچوو لە زیادبووندایە، ئەمەش ئاماژەیە بە هێز و توانای ئیـسلام و لاوازی و داهێزرانی رۆژئاوا.

**سـێیەم:** سـامان و کەرەسـتەی خـاو لـە وڵاتـانی مـسوڵماندا، ئەمـەش سـامانێکی گەورەیە مسوڵمانان لە میانەیەوە دەتـوانن هێزێکـی پیـشەسازیی بینـا بکـەن، بگاتـە

ئاستی نایابترین پیشەسازیی جیهانی، گەر پێشکەوتووتر نەبێت، ئەم سامانانەش زیاد دەکات، لەکاتێکدا سامانی ولاتی تر کەم دەکات.

**چوارەم:** ئیسلام گرنگترین رەگەزی هێزە لە کۆمەڵگای ئیسلامییدا، ناوبراو ئیسلام وا وێنا دەکات "ئەو ئایینەیە کە هێزێکی ئەفسوناویی هەیە لە کۆکردنەوەی رەگەزە مرۆڤایەتییە جیاوازەکان، لەژێر یەك ئالادا، دوای لابردنی هەستکردن بە جیاوازیی رەگەزی لە ناخ و دەروونیاندا. ئەوەندە وزەی گیانیی تێدایە بڕوادار هان دەدات، بە هەموو توانایەکیەوە، بەرگریی لە خاك و سامانەکەی بکات، لەو پێناوەدا هەموو شتێك هەرزانە، تەنانەت گیانیشی.

چ هێزێکی ویژدانیی ئەم ویستەی خستۆتە نێو جیهانی ئیسلامی، هێزی یەکبوونی هزری بۆ ئیسلام، بوونی هەستێکی زیندوو بۆ ئایینی ئیسلام، لە هەر شوێنێکیدا کە دێتە مەیدانەوە سەردەکەوێت بەسەر ئایدیۆلۆژیاکانی تردا.. رووکردنی مسوڵمانان بەرەو مەککە، پێگەی سەرەکیی ئیسلام، گرنگترین فاکتەرە لە بەهێزکردنی یەکێتی رەوتی نێوخۆیی لە نێوان مسوڵماناندا، شێوازێکە سیفەتی پتەویی و یەکگرتوویی بەسەر هەموو سیستمەکانی ژیان لە کۆمەڵگای ئیسلامیی، دەبەخشێت.

لە پوختەی وتەکانیدا دانەر وادەبینێت کە لاوازیی رۆژئاوا بۆ پچڕپچڕیی سیاسیی و هێزی مسوڵمانانیش لە پابەندبوونیان بە ئیسلامەوە، سەرچاوە دەگرێت. گەڕانەوەی مسوڵمانان بۆ هێز و توانایان گەر بە چاکیی دەرامەتە سروشتییەکانیان و شوێنی جوگرافییان لە جیهاندا وەبەرهێنا، گەر فێری تەکنەلۆژیا بوون، هەروەك چۆن ئەورووپییەکان فێربوون، دەڵێت: "مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە، لە رۆژهەلاتی ئیسلامەوە دەستپێکردن دەگەڕێتەوە، لە ناوچەیەکدا کە هێزی ئیسلامیی لە چاخی سەرەتای ئیسلامدا دەستی پێکرد. ئەم هێزە دەردەکەوێتەوە کە خۆی لە پتەوی و یەکڕیزی ئیسلام و یەکبوونە سەربازییەکەیدا دەبینێتەوە، ئەم هێزە بوونی خۆی دەچەسپێنێت، گەر مسوڵمانان زانییان چۆن دەریبێنن و کار بکەن بۆ سوود لێ وەرگرتنی ئەم هێزە، تەرازووی هێز هەڵوگێڕ دەکاتەوە، چونکە لەسەر بنەمایەك

دانراوە، کە لە هێزە جیهانییەکانی تردا بوونی نییە.

نووسەری ئینگلیزی (هیلر بلوك) درکی بە ئاستی کارایی ئەم هێزە کردووە، کاتێك جەختی دەکردەوە کە هیچ گومانێك نییە، شارستانییەك بەشەکانی بە پێوەندێکی پتەو پێکەوە گرێ درابێت، تەنیشەکانی بە شێوەیەکی بەهێز و پتەو یەکیان گرتبێت، لەناخیدا بیروباوەڕێکی وەك ئیسلامی هەلگرتبێت، تەنها ئایندەیەکی گەش چاوەڕوانی ناکات، بەڵکو دەبێتە مەترسیی لەسەر نەیارەکانی.

(شمتز) ئەوروپا ئاگادار دەکاتەوە لە مەترسیی ئەو هێزە گەشەسەندووە نوێیەی لە گەلانی ئیسلامیدایە، بانگەشە دەکات کار بکرێت بۆ ئەوەی بە توندیی بەرپەرچی ئەو هێزە بدەنەوەو لە زیادبوون و گەشەکردنی راگرن، تا ئەوروپا خاوەنی دەسەڵاتی ئابووری و سیاسیی بێت. دەڵێت: "رابوونی جیهانی ئیسلامیی دەنگێکی ئاگادارکەرەوەیە بۆ ئەوروپا و لە ئاسۆکانیدا دەخولێتەوە"، ناوبراو بانگەواز دەکات بۆ یەکڕیزیی و پشتیوانیکردنی ئەوروپا بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەم زلهێزە کە دەستی کردووە بە هەستان و خەو لە چاوەکانیدا لادەبات.

دواتر ئامۆژگاریی ئەوروپییەکان دەکات، کە وریا بن بۆ راگرتنی گەشەکردنی فاکتەرەکانی هێز لەنێو مسوڵمانانیدا، بە هەر رێگایەك بێت، گەر دەیانەوێت باری نێودەوڵەتییان لە رووی سیاسی و ئابوورییەوە بپارێزن، هیچ شتێکیان لەبەردەمدا نییە جگە لە یەکگرتنیان لەژێر دروشمی (یەکێتیی ئەوروپا)دا نەبێت.

وای دەبینێت کە دەشێت مسوڵمانان پێشکەون لە زانست و تەکنەلۆژیادا، هەروەك چۆن ئەوروپییەکان پێشکەوتن، ئەوان لەم کاتەدا پێویستیان بە کۆبەندییەك نییە کۆیان بکاتەوە جگە لە ئیسلام، ئیسلامیش بەردەوامەو تا ئێستا لەدەستیان نەداوە.

کتێبەکەی (شمتز) دەکرێت بانگەوازێك بێت بۆ مسوڵمانان، تا بڕوایان بە ئیسلام و پابەندبوون پێیەوە زیاد بکات، بۆ مانەوەی بوونیان و پاراستنی سەربەخۆیی سیاسی و ئابوری و خولیاو تامەزرۆییەك بێت بۆ گەیشتن بە چەقی سەرکردایەتی کە ئیسلام بۆ ئەمە رایاندەهێنێت. لەبەر ئەوەی هێزی ئیسلام لە کۆکردنەوەی مسوڵمانان هیچ

لاوازییەکی تێنەکەوتووە، هەر ڕووداوێك کە بەسەر مسوڵمانان‌دا هاتبێت لە سەدە دواییەکاندا، سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، لەوەی متمانەی مسوڵمانان لەق بکات بە ئیسلام وەك هێزێکی گیانیی ئەرێنی.

تەنها (باول شمتز) نییە کە ڕۆژئاوا ئاگادار بکاتەوە لە وریابوونەوەی مسوڵمانان، هانی ڕۆژئاوا بدات بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییەی کە هەڕەشە لە ڕۆژئاوا دەکات.

لیژنەیەکی نێودەوڵەتی هەیە بە بڕیاری (سێر هنری کامبل بانرمان) پێکهێنراوە، ناوبراو یەکێکە لە سەرۆك وەزیرانەکانی پێشتری بەریتانیا، لە هۆکارە بەردەستەکانی پاراستنی داگیرکاری ڕۆژئاوای کۆڵییەوە، لەگەڵ دابینکردنی مسۆگەریی مانەوەی داگیرکەران.

گرنگترین بەشی ڕاپۆرتی لیژنەکە، کە لە ساڵی ١٩٠٧ز دەرچووە، دەڵێت: مەترسی گەورە لەسەر ئیستعمار خۆی لە ناوچەی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا) دەبینێتەوە، ئەم ناوچەیە لانکەی شارستانییەکان و ئایینەکان بووە، گەلێکیش تێیدا نیشتەجێیە، یەکێتیی مێژوویی و زمان و بەهاو خواست و سامانی سروشتییان لەبەردەستدایە، سەرەڕای هەواداریی خەڵکەکەی بۆ ڕزگاربوون، ئەمەش وادەکات ساز و ئامادە بێت بۆ هەستانەوەی سەرلەنوێ و سەرکردایەتیی شارستانی مرۆڤایەتی بۆ خۆیان دابڕنن. مشتومڕی ناوێت، ئەو هێزەی کە لیژنەی (بانرمان)ی تۆقاندووە بریتییە لە هێزی ئیسلام. ئەو نەتەوەیەی کە یەکێتی زمان و مێژوو و خواست تیایدا دەستەبەر بێت، نەتەوەی ئیسلامە، ئەو ئایینەش کە نەتەوەکە بڕوای پێیەتی ئایینی ئیسلامە.

سەبارەت بە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییەی کە هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی داگیرکار دەکات، یەکێك لەو ڕەگەزانە جیاکردنەوەی بەشی ئەفریقی ناوچەکە بوو لە بەشە ئاسیاییەکەی، بە دانانی بەربەستێکی مێژوویی بە هێزێکی نامۆ، تا پردی بۆشایی نێوان هەردوو کیشوەرەکە پڕ بکاتەوە، تا لەم ناوچەیەداو نزیك بە کەناڵی سوێس، هێزێکی دۆستی ئیستعماری ئەورووپی بێت و

نەیار و دوژمنی خەڵکی وڵات و ناوچەکە بێت.

ڕۆژئاوا سووربوو لەسەر جێبەجێکردنی ئەو پێشنیارەو بە هەموو هێـز و توانایـەوە هەستا بە چاندنی هێزێکی دۆست بۆ ئیستعماری ئەوروپی و نەیار بۆ خەڵکی وڵاتەکە، ئەویش قەوارەی (ئیسرائیل)ە.

هەندێك لـە سیاسـەتمەدارانی ڕۆژئـاوا هەنـدێك جـار پاڵپـشتی ڕەوتێـك دەکـەن کـە نـەیاری خۆیـانن، گـەر ئـەو هاوکـاریی و پاڵپـشتییە ببێتــە مایــەی لاوازیــی هێــزی مـسوڵمانان، یـان پەکخـستنی ڕابـوونی شارسـتانییان، سـەرۆك وەزیرانـی بـەریتانیای پێشتر (ئیـدن) لـە یاداشـتەکانیدا دەڵێـت: "ئـەمریکا لـە پەنجاکانـدا پارەیـەکی زۆری بەربڵاوی خەرج دەکرد بۆ هاوکـاریکردنی کۆمۆنیـستەکان لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، مەبەستی لەم چالاکییە سیاسی و ڕۆشنبیری و زانستییە لە ناوچەکەدا بریتـی بـوو لـە خاوکردنەوەی ڕێباز و بیروباوەڕی گیانی و ئـایینی کـە دانیـشتوانی ناوچـەکە بڕوایـان پێیەتی".

ڕابەری کۆمۆنیستی کوبا، (کاسترۆ)، ئامۆژگاریی ئیسرائیل دەکات، نەهێڵێت بزاڤی فیداکاریی سروشتی ئیسلامی ئـایینی وەرگرێـت، چـونکە ئەمـە دەبێتـە مەشـخەڵێکی ئاگرینی سۆزی ئایینی، وادەکات ئەستەم بێت ئیسرائیل قەوارەکەی خـۆی بپارێزێـت، لەبەر ئەوەی فیداکاریی گەر بیروباوەڕێکی ئایینی لـەخۆ گـرت بەتایبـەت لـە کۆمـەڵگا ئیسلامییەکاندا، ئەوا هەموو بیروباوەڕەکان لە بەرامبەریدا خۆناگرن.

ئەمانە هـاواری ئاگادارکردنـەوەن، لـە نـەوەکانی شارسـتانیی ڕۆژئـاواوە دێنـەدەر، مایەپووچـی شارسـتانییەکەیان ڕادەگەیـەنن و لـە هـەمان کاتـدا هۆشـیاریی دەدەن سەبارەت بە ئیسلام، ئەو زلهێزەی گەر ڕابێت دەیانتۆقێنێ.

کرمۆڵبوون لە شارستانێتی ڕۆژئاوادا، نەخۆشییەکی کوشندەی بەردەوامـە، ڕۆژانـە لــە پەیکــەرە زەبەلاحەکــەی دەپووکێتــەوەو نزیکــی دەکاتــەوە لــە چارەنووســە مـسۆگەرەکەی کـە داڕووخـانی تـەواوە، تـا بـوار بڕەخـسێ بـۆ خـوولێکی تـازەی شارسـتانییەتێکی نـوێ، بـەڵکو مرۆڤایـەتی ڕزگـار بکـات و بیخاتـە سـەر پـەیڕەو و

بەرنامەیەکی توندوتۆڵی ژیان.

بیرۆکـەی (خـولی شارسـتانی) بیرۆکەیەکـە زۆرێـك لـە بیرمەنـدان هـەر لەکۆنـەوە وتوویانــەو بــەردەوام کەســانێك هــەن بڕوایــان پێیــەتی و بەڵگــە و گــەواهی بــۆ کۆدەکەنەوە.

پوختەی بیرۆکەکە ئەوەیە، هـەر شارسـتانییەك تەمـەنێکی هەیـە، درێـژ بێـت یـان کورت، بەڵام رووخان چارەنووسی کۆتایی هەموویانەو پێویستە بمرێت و شوێن بەجێ بهێڵی بۆ شارستانییەتێکی نوێی تر.

زانـای گـەورە (ئـیبن خەلـدون) دەوڵـەتانی بـە تاکـەکان وێنـاکردووە، لـە رووی گەشەکردنەوە: لاوێتی، پیری، ئینجا مردن.

پێشتر ئاماژەمان بە وتەکانی فۆلنیدا کـە نیگـەرانیی خـۆی دەردەبڕێـت سـەبارەت بەو رووخانەی بەسەر شارستانییەتەکەیدا دێت، هەروەك چۆن بەسەر شارسـتانیەتییە کۆنە لەناوچووەکاندا هاتووە.

ئـەوەتا سـێر (هنـری کامبـل بانرمـان) سـەرۆك وەزیرانـی پێـشتری بـەریتانیا کـە سـەرۆکایەتی لیژنەیـەکی نێودەوڵـەتی دەکـرد کـە پێـشتر ئاماژەمـان پێـدا، دەڵێـت "ئیمپراتۆریەتەکان پێك دێن، گەشە دەکەن، بەهێز دەبن، بـۆ ماوەیـەك ئـارام دەبـن، ئینجا هێواش هێواش بەرەو ئاوابوون دەچن، ئینجا نامێنن، مێـژوو پـڕە لـەم قۆنـاغ و رۆڵانە، کە لە زۆربەی نەتەوەکان و رابوونەکانەوە بەبێ جیاوازیی دەستی پێکردوە".

دواتر پرسیار لە ئەندامانی لیژنە دەکات و دەڵێت: "ئایا هیچ هۆکـار و ئامرازێکتـان لەبەردەســتدایە، لــەم چارەنووســە بمانپارێزێــت؟ ئــەوروپا کیــشوەرێکی کۆنــەو سامانەکانی تەواو دەبن و ئاماژەکان دەرکەوتووە، لـە کاتێکـدا ئـەوانی تـر تـا ئێـستا لاون و هەوڵ دەدەن بۆ زانیاریی و رێکخستن و خۆشگوزەرانی زیاتر".

بـەڵام (تـۆینبی) مێژوونووســی بــەریتانی بــەناوبانگ، یاســای ئــاڵۆزی دانــاوە بــۆ گەشــەکردن و لەناوچــوونی مــسۆگەری شارســتانییەکان، دەڵێــت: "شارســتانییەکان لەکاتێکدا دەڕووخێن کە هێزی مرۆڤ تیایدا توندتر بێت لە هێزی ئایین".

نەتەوە یەکگرتووەکان دەرکی بە خراپیی ئەو چارەنووسە کردووە کە رووبەڕووی مرۆڤایەتی بۆتەوە، بۆ ئەم مەبەستە داوای بەستنی کۆبوونەوەی نائاسایی کرد لە سالآنی ١٩٧٤ و ١٩٧٥ز، لە کۆتایی کۆبوونەوەکاندا بە کۆدەنگ دوای گفتوگۆیەکی زۆر، بڕیاریان دا کە هۆکاری یەکەمی لادان بریتییە لە نەشیاویی ئەو سیستمەی کە ئەمڕۆ دەستی بەسەر جیهاندا گرتووە و پێویستە مرۆڤایەتی رزگار بکرێت، بە دانانی سیستمێکی جیهانیی نوێ، تا مافی رەسەن بۆ مرۆڤایەتی دەستەبەر بکات لە ژیانێکی ئازاد و ئاسایشدا.

خولی شارستانی دێت بەسەر شارستانیی رۆژئاوادا، هەروەك چۆن بەسەر شارستانێتییە پێشووەکاندا هاتووە. ئەو هەولآنەی دەدرێت بۆ ریزپەڕکردنی لەم چارەنووسە، بە بانگەشەی ئەوەی شارستانییەتێکی جیهانی رەهەندە، ئەمەش وادەکات نەمر و بەردەوام بێت، ئەمانە رزگاری ناکات لە چارەنووسەکەی، لەبەر ئەوەی مێژوو زۆر شارستانیی جیهان رەهەندی بینی و لەگەڵ ئەوەشدا هەر ڕووخا.

لەوانەیە کەسێك بڵێت ئەگەر حەتمیەتی داڕووخانی شارستانییەکان قەدەرێك بێت نەتوانیت لێی هەڵبێی و راستییەك بێت و نەتوانی نکوڵی لێ بکەیت، ئەوا هیچ پەناگەیەك نییە بۆ شارستانیی ئیسلامیی، ئەگەر سەرکردایەتی گرتە دەست جارێکی تر نەڕووخێت.

ئێمە وەك مسوڵمان لەم حەتمیەتە تێ دەگەین، لە میانەی بڕوایەکەوە کە هیچ گومانێکی تێدانییە، لە راستێتی ئەم ئایەتە پیرۆزە: (وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِنْ بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ) (الانبياء: ١٠٥).

گەر مسوڵمانان شایستەییان لەدەست دا بۆ رابەرایەتیکردنی شارستانی، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ لای غەیری ئەوان، لەبەر ئەوەی خوای گەورە لە بوونەوەردا سوننەت و یاسا و رێسای داناوە، خۆش دوانی کەس ناکات و هیچ دروستکراوێکی بە تایبەت خۆش ناوێت.

# مسوڵمانان و جێگرەوەی شارستانی

ئەگـەر چـەندین مەزەنـدەو گریمانـە ئامـاژە بـە رووخـانی شارسـتانیی رۆژئـاوا و هەڵهاتنی سپێدەی شارستانییەتێکی نویٚ بدات، دەخوازین مسوڵمانان رابەرایەتی ئەم شارسـتانییەتە بکـەن. پێویـستە لەسـەرمان چـاك بـزانین کـە خـوای گـەورە سەرکەوتنەکان نابەخشێتە کەسێك شایستەی سەرکەوتن نەبێت، مـسوڵمان بێـت یـان نامسوڵمان. لە پێویستییەکانی دادی خوایی ئەوەیـە سـوننەتەکانی جێبـەجیٚ دەبێـت بەسـەر هەمووانـدا، مـسوڵمان بـن یـا نامـسوڵمان. لـەو سـونەتانەی ئەوەیـە کەسـێك سەرناکەوێت کەرەستەکانی سەرکەوتنی پیٚ نەبێت، رابەرایەتی ناکات مەگەر کەسـێك مەرجەکانی رابەرایەتی تێدا بێت. ئەمە مانای وایـە پێویـستە مـسوڵمانان تواناکانیـان بەگەڕ بخەن، تا شایستەی دەسەڵات و جێنشینیی بن. بە هەڵەدا نەچن کـە رووخـانی شارسـتانیی رۆژئـاوا، دەبێتـە مایـەی رابەرایـەتیکردنیان بـۆ شارسـتانییەتەکە، کـە لەبەردەسـتیاندا دەڕووخـیٚ دەبێتـە دەسـتکەوتێکی سـارد و سـانا، ئەمـە خـەونی تەمەڵەکان و بیٚ کارەکان و خەیاڵ پڵاوەکانە.

شارسـتانیی رۆژئـاوا بـە هـەردوو باڵەکەیـەوە (رۆژهـەڵاتی و رۆژئـاوایی) بـەردەوام کاریگـەرێتی ئاشـکرای خـۆی هەیـە لەسـەر زۆربـەی گـەلانی سـەر زەوی، ئـەم کاریگەرێتییـە بـەرفراوانترو دوورتـرە لـەوەی درکـی پـیٚ دەکـەین، ئەمـەو رووخـان و دروستبوونی شارستانییەکان لە نێوان شـەوو رۆژێکدا نایەتـە دی، بێگومـان دەبێـت فاکتەری کات لەبەرچاو بگیرێت.

لـە لایـەکی تـرەوە دەشـێت توێـژەر بیربکاتـەوە لـەوەی، کـە لـە هۆکارەکـانی بەردەوامیی شارستانێتی رۆژئاوا، خـاڵیبوونی گۆڕەپانەکەیـە لـە هـەر جێگرەوەیـەکی شارستانیی باشتر، گونجاو بێت سەرکردایەتی شارستانیی پیٚ بسپێردرێت.

لە سایەی لاوازیی ئێستای مسوڵمانان و پارچەپارچەییان، دەشێت کەسانی تـر لـە پێـشتر بـن بـۆ رابەرایـەتیکردنی شارسـتانی، بـەم شـێوەیە لـە دەسـتی رۆژئـاواوە

دەگوێزرێتـــەوە بــۆ دەســـتی تـــر، مـــسوڵمانانیش لـــە هەڵوێـــستێکی ســـەیرکەری دەستەوەستاندا دەمێننەوە.

ئەمـەو زۆرێـك لـە نـەوەی مـسوڵمانان–تـا ئێـستا– بەهـەر هۆیـەك بێـت، شـەیدای شارسـتانیی رۆژئـاوان، گەڕانـەوەی ئەوانـە بـۆ راسـتێتی و بەرچـاوروونکردنیان بـە راستییەکان، لە گرنگترین ئەو شتانەن کە پێویستە مسوڵمانان پێـی هەسـتن، چـونکە لە لایەکەوە ئەرکی سەرشانەو هەنگاوێکیشە پێویـستە بنرێت، تـا بتـوانن سـەرلەنوێ رابەرایەتی شارستانیی بکەن.

دوای ئـەوە: لێـرەدا ئامـاژەی بابـەتی زۆر هەیـە، دەیـسەلمێنێ کـە هێڵـی بـەیانی شارستانیەتی رۆژئاوا بـەرەو لێژبوونـەوە دەڕوات، گـەواهی و بەڵگـەی زۆر هەیـە، کـە خـۆری شارسـتانیەتی رۆژئـاوا بـەرەو ئاوابوونـە، توانـای زۆری لەدەسـت داوە بـۆ رازیکردنی نەوەکانی، سـەرەڕای گـەلانی تـر، بـە کـەڵك و سـوودی شارسـتانییەتەکەو بەردەوامبوونی.

هــەموو ئەمانــە وادەکـات پرسـیارکردن لــە جێگـرەوە، پرسـیارێکی پێویـست و پێداگیریی لێ بکرێت، وەك دەردەکەوێت –تائێستا– جێگـرەوەی پـاڵێوراو کـە زیـاتر چانسی بۆ سەرکردایەتیکردنی مرۆڤایـەتی لـە خـولێکی نـوێی شارسـتانێتیدا هـەبێت، مـسوڵمانانن.. بــەهیوای ئــەوەی پــشتیوان بــەخوا، مــسوڵمانان ئەرکــە شــکۆدار و مەزنەکەی، کە چـاوەڕێیان دەکـات، جێبـەجێ بکـەن و بـەرز بنـەوە بـۆ ئـەو ئاسـتەو مەرجە بابەتییەکان بەدەست بێنن.

### گرنگترین مەرجەکان:

١) چارەســەرکردنی قــەیرانی فیکریــی، کــە ماوەیــەکی زۆرە نەتــەوەی ئیــسلامی تاســاندووە، دەرچــوون بــە تێڕوانینێکــی ئیــسلامیانەی راســت و بــە پــەیڕەوکردنی دروست.

٢) راستکردنەوەی بیروباوەڕ، تـا ببێتـە بیروبـاوەڕێکی دروسـت و لـەناو نەتـەوەی

ئیسلامدا، بەشێوەیەکی بەهێز و قووڵ و روون و سادە و تەواوکار بڵاو ببێتەوە، رەونەق و گەشیەکەی تێکەڵاوی دڵ و دەروون بێت، خاوێنییەکەی ژیرییەکان پاڵفتە بکات، زاڵ بێت بەسەر هەموو دەرهاویشتە و دەسپێکەکانی تاکەکان و کۆمەڵەکان و نەتەوە بڕوای پێ بێنێت و کارلێکی لەگەڵدا بکات، تا نەتەوە لەسەر راستێتی روون و ئاشکرا بێت، لە هەموو ئەوانەی وەری دەگرێت یان رەتی دەکاتەوە، وزەو توانای نەوەکان بتەقێنێتەوە بۆ بەخشش و داهێنان و ئاوەدانی.

٣) تێڕوانینێکی رەخنەگرانەی دادوەرانەی هاوسەنگانە، بۆ سوودوەرگرتن لە کەلەپووری مرۆڤایەتی هاوچەرخی شارستانێتی ئێستا، بۆ زانینی ئەوانەی مایەی قبوڵەو ئەوانەشی کە رەت دەکرێتەوە، بێ پاشکۆیەتییەکی رەها یان رەتکردنەوەیەکی رەها، تا ئەرێنییەکانی ئەم شارستانێتییە لە نەرێنییەکانی جیابکرێتەوە، چاکەکانی لە خراپەکانی، بەسوودەکانی لە زیانەکانی.

٤) چاك تێڕوانین لە کەلەپووری ئیسلامیی هەرەمەزن، تا شانازیکردن پێیەوەو سوود لێ وەرگرتنی بێتەدی، بێ ئەوەی بە پیرۆز دابنرێت، یان رێگریی بکرێت لە گفتوگۆکردن سەبارەت بە هەر شتێکی، سەرچاوەکانی ئیسلام شتێکە و کەلەپووری ئیسلامی شتێکی تر، وا چاکە بۆمان سوود لەم سامانە گرانبەهایانە وەرگرین، لەگەڵ زانینی ئەو خەوشانەی کە تێیدایە و زانینێکی رەخنەگرانەی بەرچاوڕوونانەی زیرەکانە.

٥) بایەخ بە چاودێریی و راستکردنەوەی بەرنامەکانی فیکر و تێکڕای کاروبارەکان و بنەما و پرەنسیپە بنەڕەتییەکانی، لە بری شوێنکەوتەیی خاڵە بچووکە گۆڕاوەکان بە بەردەوامی. لەبەر ئەوەی (بەشییەکان) بێکۆتاییە، بە پێچەوانەی بەرنامەو بنەما و تێکڕاییەکانەوە.

لێرەدا پێویستە بایەخ بدرێت بە راستکردنەوەی بەرنامەکە و تەرکیز خستنە سەری، چونکە بزاڤی عەقڵ راست دەکاتەوەو کاروانەکەی رێك دەخات و تەرازووەکان رەگاژۆ دەکات. وا دەکات چالاکییەکان بە ئاڕاستەی راستیدا بڕوات، رەفتار لقێکە لە

درککردن، بیرۆکەکان بەردەوام بریتییە لە پێشەکییەکی هەڵە یان راست بۆ هەر شتێکی تر.

٦) بەستنەوەی ئەم بەرنامەو پەیڕەوانە بە واقیعی ژیانی نەتەوەی مسوڵمانەوە، ئەمەش یارمەتی دەدات بۆ داواکردنی چارەسەر لە لایەك و واشی لێ دەکات بەخششی کرداری هەبێت لە لایەکی ترەوە. بەم شێوەیە رزگاری دەبێت لە چارەسەری تیۆری و وەنەوز و خەیاڵکردنەوە.

٧) هەوڵدان بۆ دروستکردنی دامەزراوەی ئیسلامیی جێگرەوە لە فیکر و ئابووری و پەروەردەو کۆمەڵناسی، لەبەر ئەوەی ئەم دامەزراوانە سروشتێکی کرداریی وەردەگرێت، هەروەها یارمەتیدەرە بۆ گەڕانەوەی نەتەوە بۆ ئیسلام، کە لە ژیانیدا تۆزە تۆزە پاشەکشەی لێکردبوو، دەکرێت تۆزە تۆزە بۆی بگەڕێتەوە، بە ویستی خوای گەورە.

٨) بەدیهێنانی تێڕوانینێکی شارستانیی ئیسلامیی، تا بتوانرێت دروستکردنی نەتەوەو دەوڵەتی نوێی بەهێز و پتەو و بەتواناو بەخشەر، ئەستەم نەبێت.

٩) گۆڕینی هەموو ئەمانە (بیروباوەڕ، فیکر، زانست، پەیڕەو) بۆ رێکخستنی رۆشنبیریی، کە لە تواناداا بێت پێشکەش بکرێت بە هەموو دەستەکانی نەتەوە، بە شێوەیەك خولیاکانی بەدی بێنێ و متمانەی پێ بێت و لەسەری پەروەردە بێت.

١٠) زانینی سوننەتی خوای گەورە لە دروستبوونی وڵاتان و شارستانییەتەکان و رووخانیاندا، ئەمانە سوننەتانێکن لەسەر موسڵمان و کەسانی تریش دەچەسپێن. مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم سوننەتانە بۆ گەڕانەوەی نەتەوە بۆ ئیسلامەکەی و دواتر شایستەی بکات تا ببێتە جێگرەوەی شارستانی کە هیوای لەسەر بنیات نراوە.

بەم بۆنەیەوە جەخت دەکەینەوە لەسەر لاوانی مسوڵمان و توێژەرە مسوڵمانەکان، هەستن بە توێژینەوەی سوننەتەکانی خوای گەورە لە بوونەوەردا، لە مانەوەی نەتەوەکان و لەناوچوونیان و سەرکەوتن و دواکەوتنیان و بایەخی زۆری پێ بدەن.

ئەم سوننەتانە یاسای خوایین و زۆر بەسوودن بۆمان، با ورەو هیمەتی، هەندێ لە

توێــژەرە چــالاکەکان رووبکاتـــە کێــشەکانی شارســـتانیەتی، بــۆ رووپێــوکردن و کۆکردنەوەو توێژینەوەو شیکردنەوەی ئایەتە پیرۆزەکان کە پەیوەسـتە بـەم بـوارە و دەرهێنانی پەند و ئامۆژگاری و زانینی مەرجە بابەتی و خودییـەکان و دەرەکییـەکان و ئەوانی تر، تا چەندین وانەی زۆر پێویست پێشکەش بە نەتەوە بکرێت.

بـۆ ئاگـاداربوونیش لـە هەنـدێك لـە سـوننەتەکانی خـوای گـەورە، لێـرەدا چـەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەهێنین:

خوای گەورە دەفەرموێ: [٢] (تِلْـكَ الـدَّارُ الآخِـرَةُ نَجْعَلُهَـا لِلَّـذِينَ لاَ يُرِيـدُونَ عُلُـوًّا فِـي الأَرْضِ وَلاَ فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ) (القصص: ٨٣).

ئەمــە مــاڵی دوارۆژە (بەهەشــت) دەیــدەین بــەو کەســانەی کــە نــە بــەرزی و خۆبەزلزانییان دەوێت لە زەویدا، نە دەستدرێژی و خراپەکاری، سەرەنجامی چاك بۆ خۆپارێزانە.

(إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لاَ يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ) (يوسف: ٩٠).

بەڕاسـتی هەرکـەس خـۆی بپـارێزێ و دان بەخۆیـدا بگـرێ، ئەوسـا خـوا پاداشـتی چاکەکاران ون ناکات.

(يَابَنِيَّ اذْهَبُوا فَتَحَسَّسُوا مِنْ يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلاَ تَيْئَسُوا مِنْ رَوْحِ اللَّهِ إِنَّهُ لاَ يَيْئَسُ مِـنْ رَوْحِ اللَّهِ إِلاَّ الْقَوْمُ الكَافِرُونَ) (يوسف: ٨٧).

(یەعقوب وتی) ئەی کوڕەکانم، بڕۆن، جا بگەڕێن و هەواڵی یوسف و براکەی بـزانن، نائومێدیش مەبن لە بەزەیی و میهرەبانیی خوا، بەراستیی نائومێـد نـابێ لـە ڕەحـم و میهرەبانی خوا، جگە لەوانەی کە بێ بڕوان.

(وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَالَّذِي خَبُثَ لاَ يَخْرُجُ إِلاَّ نَكِدًا) (الاعراف: ٥٨)

---

[٢] راڤەی ئایەتەکان لە پوختەی تەفسیری قورئان، لە ئامادەکردنی مەلا موحەممەد مـەلا صـاڵح وەرگـیراوە. (وەرگێڕ).

زەوی و خـاکی پـاك و بـەپیت، رووەك و شـینایییەکەی بـە فـەرمانی پـەروەردگاری دەڕوێت، ئەوەی پیس و بیٚ خێرە، دڕك و داڵ نەبیٚ لێی ناڕویٚ و دەرنایە.

(لاَ يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلاَدِ * مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَـادُ * لَكِنْ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلاً مِـنْ عِنْـدِ اللَّـهِ وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ لِلْأَبْرَارِ) (آل عمران: ١٩٦–١٩٨).

لەخـشتەت نـەبات (فریـوت نـەدا) هاتوچـۆی ئەوانـەی بـیٚ بـڕوان (بـە خۆشـی و ئاسودەییەوە) لە ولاتدا. (ئەو ئاسوودەییەی ئەوان) خۆشییەکی کەمە، پاشان جـیٚ و شوێنیان دۆزەخە، ئای چ شوێنێکی بەدە. بەڵام ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسـن بۆیان هەیە بەهەشتانێك کە رووبارەکان دێن و دەچن بە ژێریانـدا، تیایـدا دەمێننـەوە بە هەمیشەیی. ئامـادە کـراوە لـە لایـەن خـواوە، ئـەوەی کـە لای خوایـە چـاکترە بـۆ پیاوچاکان.

(الَّذِينَ كَفَرُوا وَصَدُّوا عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ أَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ) (محمد: ١).

ئەو کەسانەی بێبـاوەڕ بـوون، بـەرگری (خـەڵك)یـان کـرد لـە رێبـازی خـوا، (خـوا) کردەوەکانیان پووچەڵ دەکاتەوە.

(وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُورًا) (الفرقان: ٢٣).

هاتین و هەر کردەوەیەکیان کردبوو، هەموویمان وەکو تۆزی پرش و بڵاو لیٚ کرد.

(وَمَـا أَرْسَـلْنَا فِـي قَرْيَـةٍ مِـنْ نَبِـيٍّ إِلاَّ أَخَـذْنَا أَهْلَهَـا بِالْبَأْسَـاءِ وَالـضَّرَّاءِ لَعَلَّهُـمْ يَضَّرَّعُونَ(٩٤)ثُمَّ بَدَّلْنَا مَكَانَ السَّيِّئَةِ الْحَسَنَةَ حَتَّى عَفَوا وَقَـالُوا قَـدْ مَـسَّ آبَاءَنَـا الـضَّرَّاءُ وَالسَّرَّاءُ فَأَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً وَهُـمْ لاَ يَـشْعُرُونَ(٩٥)وَلَـوْ أَنَّ أَهْـلَ الْقُـرَى آمَنُـوا وَاتَّقَـوْا لَفَتَحْنَـا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنْ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) (الاعـراف: ٩٤–٩٦).

ئێمە بۆ هەر گوند و شارێك پێغەمبەرێکمان رەوانە کردبێـت دانیـشتوانیمان تـووش کردووە، بە نەبوونی و کەمدەرامەتی و (بە زیـان و نەخۆشـی) تـا لـە پـەروەردگاریان بپاڕێنەوەو پەشیمان ببنەوە. لە دواییدا خراپە و ناخۆشـییەکەمان گـۆڕی بـە چـاکە و

خۆشـی، هـەتا زۆر بـوون و گەشـەیان کـرد لـە مـاڵ و سـەروەتدا. وتیـان بێگومـان باووباپیرانمان تووشی زیان و ناخۆشی و خۆشی بوون، جا لەناکاودا سـزامان گرتنـی، لە کاتێکدا کە هەستیان نـەدەکرد. ئەگـەر دانیـشتوانی شـارەکان باوەڕیـان بهێنایـەو خۆیان بپاراستایە (لە قەدەغەکراوەکانی خوا) بەراستی دەرگای بەرەکاتی ئاسمـان و زەویمان بۆ دەکردنەوە، بەڵام بڕوایـان نـەهێنا بـە (پێغەمبەرەکـەیان) ئینجـا ئێمـەش ئەوانمان گرت و سزامان دان.

(مَا يَفْتَحْ اللَّهُ لِلنَّاسِ مِنْ رَحْمَةٍ فَلاَ مُمْسِكَ لَهَا وَمَا يُمْسِكْ فَلاَ مُرْسِلَ لَهُ مِنْ بَعْدِهِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ) (فـاطر: ٢) خـوا هـەر بـەهرەو چـاکەیەك بـۆ خـەڵك بـەرەڵا بکـات و بیکاتەوە، ئیتر بەرگریکەرێکی بۆ نییە، خوا هـەر بەهرەیـەك بگرێتـەوە، ئـیتر لـەپاش گرتنەوەی خوا بەرەڵاکەر و نێرەری بۆ نییە، خوا زاڵی کاردروستە.

(فَلَمَّا أَلْقَوْا قَالَ مُوسَى مَا جِئْتُمْ بِهِ السِّحْرُ إِنَّ اللَّهَ سَيُبْطِلُهُ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ(٨١)وَيُحِقُّ اللَّهُ الْحَقَّ بِكَلِمَاتِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُجْرِمُونَ) (يونس: ٨١-٨٢).

ئینجـا کـاتێ (جادووەکانیـان) فـڕێ دا، مووسـا وتـی: هەرچـی ئێـوە هێناوتانـە جادووە، بێگومان خوا بە زوویی پووچەڵی دەکاتـەوە، چـونکە بەراسـتی خـوا چـاکی ناکات کردەوەی خراپەکاران، خـوا حـەق و راسـتی سـەردەخات (دەچەسـپێنێت) بـە فەرمان و بەڵێنەکانی، با تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت.

(وَإِذْ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لاَ يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ) (البقرة: ١٢٤).

(بیربکەنەوە) کاتێك خوا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بـە چـەند بڕیـار و فەرمایـشتێك، کە ئەویش بەجێی هێنـان، (خـوا) فـەرمووی: بێگومـان مـن تـۆ دەکـەم بـە پێـشەوای خەڵکی، (ئیبراهیم) وتی: لە نەوەشم ئەکەیت (بە پێشەوا)؟ فـەرمووی: پێغەمبـەرێتی من ناگات بە ستەمکاران.

(أَنزَلَ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاءَ حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ

فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ) (الرعد: ١٧).

بارانی لە ئاسمانەوە باراندووە، جا هەر شیو و دۆڵێك بە ئەندازەی خۆی لافاوی هەڵدەستێت، ئەوسا لافاوەکە هەڵی دەگرێت کەفێکی بەرزبووە (بە لافاوەکە)، هەروەها لەو (کانزایانەش پەیدا دەبێت) کە ئاگری بۆ تاو دەدەن (دەیتوێننەوە) بە مەبەستی دروستکردنی خشڵ، یان شتومەکی تر (وەك قاپ و قاچاخ) کەفێك وەکو ئەو (کەفی لافاوە پەیدا دەبێ) ئا بەو جۆرە خوا نموونەی حەق و بەتاڵ دێنێتەوە، جا کەفەکە دەڕوات و لەناو دەچێ، بەڵام ئەوەی کە سوود دەگەیەنێ بە خەڵکی، لە زەویدا دەمێنێتەوە، ئا بەو جۆرە خوا نموونەکان دەهێنێتەوە.

(لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ) (سبأ: ١٥).

سوێند بەخوا بە راستی بۆ خەڵکی (سبأ) لەو شوێنی ژیانەیاندا نیشانەیەك (لەسەر دەسەڵاتی خوا) هەبوو، دوو باخات لای راست و لای چەپی (شوێنەکەیانەوە) هەبوو، (پێیان وترا) لە رۆزی پەروەردگارتان بخۆن و سوپاسی ئەو بکەن، وڵاتێکی پاك و خۆش و پەروەردگارێکی لێبوردە (یان هەیە).

(إِنْ يَنْصُرْكُمْ اللَّهُ فَلاَ غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلْ الْمُؤْمِنُونَ) (آل عمران: ١٦٠).

ئەگەر خوا سەرتان بخات، ئەوە هیچ کەس زاڵ نابێ بەسەرتاندا، ئەگەر یارمەتیتان نەدات (پشتتان بەردات) کێیە ئەو کەسەی لە پاش خوا سەرتان دەخات؟ با بڕواداران پشت هەر بەخوا ببەستن.

(وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ) (السجدة: ٢٤).

لەناو ئەواندا پێشەوایانێکمان دانا رێنموونی (خەڵك)یان دەکرد بە فەرمانی ئێمە، کاتێ خۆیان گرت و بە ئایەتەکانی ئێمە دڵنیا بوون (باوەڕی پتەویان هێنا).

(ذَلِكَ بِأَنَّ اللَّهَ لَمْ يَكُ مُغَيِّرًا نِعْمَةً أَنْعَمَهَا عَلَى قَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ وَأَنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (الانفال: ٥٣).

ئەوە بەهۆی ئەوەوەیە کە بەراستی خوا هیچ بەهرەو نیعمەتێك ناگۆڕێ کە بەخشیبێتی بە هەر هۆزێك، هەتا ئەوەی لە خۆیاندا نەیگۆڕن، بەراستی خوا بیسەری زانایە.

(وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُمْ بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِنْ مَحِيصٍ) (ق: ٣٦).

پێش ئەمان گەل و چینی زۆرمان لەناوبرد، کە ئەوان لەمانیش بەهێزتر بوون، خۆ ئەوان شاران و وڵاتانیان پشکنیوەو گەڕاون، ئایا هیچ پەناگەیەك هەبوو (بۆیان لە مردن).

(أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ مَكَّنَّاهُمْ فِي الأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّنْ لَكُمْ وَأَرْسَلْنَا السَّمَاءَ عَلَيْهِمْ مِدْرَارًا وَجَعَلْنَا الأَنْهَارَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ وَأَنشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ) (الانعام: ٦).

ئایا نەیاندیوە (نەیانزانیوە) لەپێش ئەوانەوە چەند گەل و نەوەمان لەناوبردووە، دەسەڵاتمان پێدابوون لە زەویدا، بە شێوەیەك کە بە ئێوەمان نەدابوو، بارانی پەیتاپەیتامان بەسەرا باراندن، جۆگە و رووبارەکانمان وا لێکردبوو کە بە بن باغ و جێگاکانیاندا دەڕۆیشت، لەناومان بردن بەهۆی گوناهەکانیانەوە، لە دوای ئەوان دروستمان کرد گەل و نەتەوەی تر.

(فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ) (الانعام: ٤٤).

جا کاتێ لەبیریان چووەوە ئەوەی کە پێی ئامۆژگاری کران، دەرگای هەموو شتێکمان لەسەر کردنەوە، تا کاتێ دڵخۆش بوون بەوەی پێیان درابوو، لە ناکاودا تۆڵەمان لێ سەندن، ئیتر ئەوانیش نائومێد و سەرگەردان بوون.

(وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِنْ شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ) (ابراهيم: ٧).

(بیریان بخەرەوە) کاتێ کە پەروەردگارتان رایگەیاند سوێند بێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی (چاکەی) من بکەن، بۆتان زیاد دەکەم، بەڵام بێگومان ئەگەر ناسوپاسی بکەن ئەوە بەڕاستی سزای زۆر بەتینە.

قسەکردن لەسەر نەتەوەو شارستانییەکان، پێشکەوتنی نەتەوەکان و داڕمانیان، لایەنێکی گەورەی لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا گرتووە، بێگومان توێژینەوەیەکی لەسەرخۆ و هوشیارانە و گەشاوە بە رووناکی خوای گەورە، توێژینەوەیەکی بەهادار و بەسوود و ئامانجدار لەم بوارەدا، سوودی باش پێشکەش نەتەوەو مرۆڤایەتی دەکات.

مرۆڤەکانیش پێویستیان بە تێگەیشتن و هەزم کردنی هەیە، بۆ رزگارکردنی نەتەوەو مرۆڤایەتی کە لەسەر لێواری تیاچوونە. خوای گەورە راست دەفەرموێت و هەر ئەویش رێنوێنیکەرە بۆ رێبازەکەی.

# ناوەرۆک

# پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامیی

دامەزراوەیەکی فیکریی ئیسلامیی رۆشنبیریی سەربەخۆیە، لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمی کۆچی (١٤٠١ك ـ ١٩٨١ز) لە ویلایەتە یکگرتووەکانی ئەمریکا دامەزراوە، تا کار بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە بکات:

– فەراهەمهێنانی تێڕوانینی گشتگیرانەی ئیسلام، لەپێناو تەئسیلکردنی مەسەلە هەنووکەییەکانی ئیسلام و روونکردنەوەیان، هەروەها لەپێناو پێکەوەگرێدانی بەش و لقەکان بە هەمەکییەکان (الكليات) و مەبەست و ئامانجە گشتییەکانی ئیسلام.

– گێڕانەوەی ناسنامەی فیکریی و رۆشنبیری و ژیاریی بۆ ئوممەی ئیسلامیی، ئەویش لە میانەی چەند هەوڵ و کۆششێکی بەئیسلامکردنی زانستە مرۆڤایەتیی و کۆمەڵایەتییەکان و چارەسەرکردنی مەسەلەکانی فیکری ئیسلامیی.

– چاکسازی لە پرۆگرامەکانی فیکری ئیسلامیی هاوچەرخدا، بۆ ئەوەی ئوممەی ئیسلامیی توانای دووبارە گەڕاندنەوەی شێوە ژیانە ئیسلامییەکەی خۆی و هەروەها رۆڵی خۆی لە ئاراستەکردنی کاروانی ژیاری مرۆڤایەتی و بەرچاورۆشنکردنی و گرێدانی بە بەها و ئامانجەکانی ئیسلامەوە هەبێت.

پەیمانگا، بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی چەند هۆکارێك دەگرێتەبەر لەوانەش:

– بەستنی کۆنگرە و سیمیناری زانستی.

– هاوكاريى هەولْو كۆششى زانا توێـژەرەوەكانى زانكـۆ و بنكـەكانى توێژينـەوەى زانستيى و بڵاوكردنەوەى بەرهەمە زانستييە نايابەكان.

– ئاڕاسـتەكردنى توێژينـەوە زانـستى و ئەكاديمييـەكان لـەپێناو خزمـەتكردن بـە فيكر و مەعريفە.

هەروەها پەيمانگا چەند نووسينگە و لقێكى لە پايتەختى وڵاتە عەرەبى و ئيسلامييەكان و وڵاتانى تريش هەيە، كە لەڕێگەيانەوە كارو چالاكييە جۆراوجۆرەكانى خۆى ئەنجام دەدات، هەروەها چەند ڕێكەوتننامەيەكى لەگەڵ ژمارەيەك زانكۆى عەرەبى و ئيسلاميى و خۆرئاوايى لە سەرانسەرى جيهاندا بۆ هاوكاريى زانستى هاوبەش هەيە.